# پەیوەندی نێوان ئایین و ئەدەب

علی صالح میران

## بـــــــــــــــەرایـی

مەســەلەی ئیــسلامو شــیعر باسـێکی مێژووییــەو، دەگەڕێتــەوە بـۆ سەدان ساڵ لەمەوبەر، کە قسەو باسی زۆری دەربارە کراوەو بـووە بـە مەســەلەیەکی فیکـری‌و شـێواز ئـاڵۆزو چـەندان توێـژەرو پـسپۆڕی لێکۆڵینەوەی ئیسلامی و ئەدەبی پێی شەکەت بووینە.

ئــەم لێکۆڵینــەوەش تێڕوانینــی چــەندان کــەس هەڵـدەگرێت لــە چــەندین قۆنــاغ دا، بەشــی یەکــەمی لێکۆڵینەوەکــە تایبەتــە بــەو شــیعرانەی کــە لــە ســەرەتای ئیــسلامەتیدا ســەریان هەڵــداوەو، لەوسەردەمەدا شیعر بووە بە چەکێکی کاریگەر لە جەنگ‌و ململانێی نێـوان دوو جـۆر لـە جۆرەکـانی فیکروئایـدۆلۆژیا....کـە یەکـەمیان تێڕوانینی ئیسلامیانەیە، تێڕوانینێکی فیکری: (ئـایینی و رامیـاری و کۆمەڵایــەتی) بــۆ تێکــڕای گــەردوون‌و ژیــان‌و لــەنێوان تێڕوانینــی ناخودایـان، هـەروەها شـیعر لـە بۆچـونی پێغەمبـەرو یـارانی باسـی سەرەکی ئەم بەشەیە.

بەشــی دووەم تایبەتــە بــە لاوازی شــیعر لــە ســەردەمی زووی سەرهەڵدانی ئیسلامەتیەوە، تیایدا بیروبۆچوونی چەندین ئـەدیب‌و توێژەرو رەخنەگران وەخۆیەوە دەگرێ.

بەشی سێیەمیش بریتی یە لە هەڵوێستەیەك لە دەروازەی ئەدەبی ئیسلامی یەوە، ئەو ئەدەبەی جارێك بە(ئەدەبی موسڵمان)و جارێكی تر بە(ئەدەبی بانگەواز)و جارێكی تر بە(ئەدەبی جیهاد) بانگەشە دەكرا..

تا لەسەر زاراوەی(ئەدەبی ئیسلامیی) قەرار گیر بوو، كە لەم رۆژانەدا لە بازنەی تیۆری خۆی دەترازێو هەوڵی پراگتیزەی بیرو بۆچوونەكانی خۆی دەداتو هەنگاوی گەورەو بەپێز دەهاوێژێ، خەریكە لەناو هەموو نەتەوەكاندا شاعیرو رەخنەگرو ئەدەب دۆستی خۆی دەبێو بەرهەمە بە پێزەكانیان خەریكە سەر هەڵدەدەن.

ئەم هەوڵانەش لەم نامیلكەیەدا، كردنەوەی دەلاقەیەكەو تەكانێكیشە بۆ كردنەوەی دەروازەی ئەدەبی ئیسلامیو، خستنە كاری خامە رەسەنەكان بۆ زیاتر توێژنەوەو لێكۆڵینەوەی ئەم بابەتە.

---

---

## كاریگەری پەیدابوونی ئیسلام لەكاتی خۆیدا

ئیسلام هەر لە كاتی سەرهەڵدانییەوە خاوەن بیرێكی نوێو هەڵگری بانگەوازی ئاینیو كۆمەڵایەتی و رامیاری بووەو، لەسەر بنچینەی باوەڕ بە تاكە خوایەك و مل كەچ كردن بۆ خوای تاكو تەنهاو لە بەدكاری دووركەوتنەوە دامەزرا.

**ئیسلام بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی نوێی یەکگرتوو، بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی ئادەمیزاد لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بە ئادەمیزادەوە هات.**

**ئیسلام لە رووی کۆمەڵایەتییەوە یەکێتی کۆمەڵی چەسپاندو، ریشەی رەوشتو خۆشەویستیو بەیەکەوە ژیانی ئەندامانی کۆمەڵی داکوتا، بە هەموو گورەوە هەوڵی دا رەگی رەگەزپەرستیو دەمارگیریو خێڵەکی ریشەکێش کا.**

**ئەم ئاینە هەر لە سەرتای سەرهەڵدانییەوە، دژی هەموو جۆرە دووبەرەکیو دەمارگیرییەکی تەسکی خێڵەکی وەستا، رەوشتی بەرزی ئاینی نوێی لەسەر بنەمای باوەڕو خواپەرستی دامەزراندو رێزو پایەی مرۆڤی بەم سەنگو پێوانە بەستەوە.**

**لە ئەنجامی ئەم بیروبۆچوونە نوێیانەی ئیسلامدا، کە موسوڵمانانی پێشوو هەموو هەوڵێکیان بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی بوو، سەرلەبەر بوون بە هۆی یەکخستنی دەمارگیری خێڵەکی و بەرزبوونەوەی یەکێتی رێزەکانی کۆمەڵو پەرەسەندنی نما بەرزە مرۆڤەکییەکان، ئەوەش شتێکی خواسایی بوو کە شۆڕشێکی گەورە لە ژیانی جاهیلیەتدا هەڵگیرسێنێو، ئەم بارە چەوتەی پێش ئیسلام راست بکاتەوە... ئەم هەموو گۆڕانکاریانەش لەو قۆناغەدا کە کارێکی گەورەیان لەنێوەرۆکی شیعر کرد، لە ژێر سایەی پێغەمبەر(د.خ)و جێنشینو هاوەڵەکانی دا بن چەسپ ببوو..**

**جا بۆ لێوە تۆژینی هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر شیعرو شاعیران، بەتایبەتی لە سەردەمی هاتنە خوارەوەی پەیتا پەیتای ئایەتە**

پیرۆزەکـانو، فـەرموودەکانی پێغەمبــەری مەزنــدا، پێویــستمان بــە هەڵوێــستی قورئــانو پێغەمبــەر(د.خ)و هاوەڵـەکانی هەیــە، چـونکە ئەوانە سەرچاوە گـەلێکی سـەرەتایی ئـەوتۆن بـۆ زێـتر لـە تێـڕوانینو باری سـەرنجی ئیـسلام لەمـەڕ شـیعرو شـاعیران تێگەیـشتن، دەتـوانین پشتیان پێ ببەستین.

## کاریگەری شیعر لە کۆمەڵگای نەزانیدا :

بۆ دەرخـستنی کاریگـەری دەوری شـیعر لـە سـەردەمی جاهیلیەتـدا (کە بۆتە راستییەکی بەهادارو ناتوانرێ چاوپۆشی لێ بکرێ) بەڵگەی بەهێز بەدەستەوە هەیە.

شیعر لە سـەردەمی جاهیلی دا ، بـە شـێوەیێ کـە لـە پێداویـستییە گرنگەکانی کۆمەڵایەتی بووەو لەگەڵ باری رامیاریو ئابووریو ئاینی و سەربازیدا پەیوەنداریش بووەو، دەورێکی سامناکی گێڕاوە.

(عومـەری کـوڕی خـەتتاب) دەڵـێ: (شـیعر ئـاڵای نەتەوەکەیـەتیو هیچ ئاڵایەکیش لەو ئاڵایە باشتر نییە.) [1].

(ئیبنو عەبباس) دەڵێ: (شیعر دیوانی عەرەبە.) [2].

هێزو کاریگەریەکەی لەوسەردەمەدا زۆر لە شـیرو تـیر کاریگـەر تـر بـووەو، گـەورەترین کانگـای زانیـاری عەرەبـەکانیش بـوو، تەنانـەت پێغەمبــەر(د.خ) دەیفــەرموو: (زۆر لــە شــیعران پەنــدو عیبرەتیــان تێدایـە.) ئـەبوداود دەڵێـت: گرنگـی شـاعیران بەڕادەیـەك بـوو، کـە لــەنێوان خێڵــەکانی عەرەبــدا هاتبــا تیرەیــەك، شــاعیرێکی لــێ

هەڵکەوتایە.. ئەوا هەموو پیاو ماقوڵانی خێڵەکانی دیکە دەهاتنە سەردانی ئەو خێڵەو پیرۆزباییان لێ دەکرد [٣].

گەورەترین بەڵگە بۆ دەوری شیعر لەو سەردەمەدا ئەو بەڵگەیەیە کە قورئانی پیرۆز چەندان جار باسی شیعرو شاعیرانی کردوە.

## هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر شیعرو شاعیران

### ١-لە روانگەی قورئانەوە:

گەر سەیرێکی ئەم ئایەتە پیرۆزانە بکەین، کە دەربارەی شیعرو شاعیران خودا بۆ پێغەمبەر(د.خ)ی ناردوونە خوارەوە، چاوێکیان پێدا بخشێنین ئەو کاتە ئەم دوو هەڵوێستەمان بۆ دەردەکەوێ:-

یەکەم: دەگەڵ شاعیراندا هاوسەروکارە

دووەم: لەگەڵ شیعردا هاوپێوەندە

ئەم ئایەتە پیرۆزانەش کە دەربارەی شاعیران خودا فەرموویەتی ئەم چەند ئایەتەن:-

أ/ ﴿ بَل قالوا أضغاث أحلامٍ بل أفتراه بل هوَشاعرفليأتنا بآية كما أرسل ألاولون ﴾(١)الأنبياء: ٥

( بەڵکو (شتی سەیرو سەمەرە)دەڵێن: (وەك ئەوەی کە گوایە ئەم قورئانە):خەوو خەیاڵی بێ سەرو بنە، یاخود هەڵیبەستووە، بەڵکو ئەو کەسێکی شاعیرە،دەبا بەڵگەو (موعجیزە)یەك نیشان بدات، وەکو پێغەمبەرانی پێشوو).

ب/﴿ والشعراء يتَّبعهم الغاوون* ألم تر أنهم في كل وادٍ هيمون وأنهم يقولـون مـالايفعلون* إلا الذين آمنوا وعملوا الصالحات وذكروا الله كثيراً وانتصروا من بعد ما ظلمـوا وسـيعلم الـذين ظلموا أى منقلب ينقلبون ﴾(٢)الشعراء: ٢٢٤ - ٢٢٧

(سەرگەردان و سەرلێشێواوەکانیش شوێن شاعیران دەکەون ⋆ ئایا نابینی ئەوانە لە هەموو دۆڵێکدا سەرهەڵدەدەن و لە هەموو شتێك

دەدوێن ⋆ ئەوانە شتێك دەڵێن و بەكردەوە نایكەن (كرداروگوفتاریان لە یەك دوورە) ⋆ جگە لەوانەی كە باوەڕیان هێناوەو كاروكردەوەی چاك ئەنجام دەدەن و یادی خوا زۆر دەكەن و بەم توانایەی كە هەیانە كاتێك كە ستەمێكیان لێ بكرێت پشتگیری لە ئیماندااران دەكەن ، سەرەنجام ئەوانەی ستەمكارن دەزانن كە چۆن ژێرەوژوور دەبن و تیا دەچن)

جـ/﴿ وماهو بقول شاعرٍ قليلاً ماتؤمنون* ولا بقول كاهنٍ قليلاً ماتذكرون ﴾(٤)الحاقة: ٤١ ــ ٤٢

(دڵنیا بن كە ئەم قورئانە گوفتاری شاعیر نییە ، جا بۆ كەمتان باوەڕدێنن؟ ⋆ گوفتاری فاڵچی و زێوانیش نییە ئەوە بۆ زۆركەمتان یاداوەری وەردەگرن؟)

د/﴿ أم يقولون شاعر نتربص به ريب المنون ﴾ (٥)الطور: ٣٠

(خوا نەناسەكان یان دەڵێن شاعیرەو چاوەڕوانی مەرگی دەكەین).

ئەم ئایەتە پیرۆزەی كە باسی شیعر دەكات.. ئەو ئایەتەیە كە دەفەرمووێ:

﴿ وما علّمناه الشعر ومايننبغي له إن هو إلاّ ذكر وقرآن مبين ﴾(٦)يس: ٦٩

(ئایەتەكانی قورئانیان بە شیعر داوەتە قەڵەم و پێغەمبەریشیان (ﷺ)بە شاعیر داناوە،بۆیە دەفەرموێت:وەنەبێ شیعرمان فێركردبێ و ئەویش شیعری لێ قەدەغەیە،بەڵكو ئەو یادخەرەوەی رێبازی راست و درووستە).

ئەوكاتەی كە پێغەمبەریان بە شاعیر دادەنا.. هەروەكو لەو ئایەتانە: ﴿ الانبياء/٥ ، الصافات/٣٦ ، الطور/٣٠﴾ دا هاتووە، لە ئایەتی(٢٢٤ تا٢٢٦)ی سوورەتی(الشعراء) دا باسی ئەو جۆرە

شاعیرانەی کە دژی پێغەمبەر(د.خ) و پەیامی خوا ئەسپی شیعری خۆیان تاو دەدا، دەکەن.

لە ئایەتی(٤١ تا٤٢ لە سوورەتی الحاقە) دا تۆمەتی شاعیریەتی لەسەر پێغەمبەر(د.خ) هەڵدەگرێ.

لە ئایەتی(٦٩ لە سورەی یاسین) دا وادەگەیەنێ کە فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ) شیعر نینو نابێ شیعر بن.

ئایەتەکانی(١٩٢تا١٩٥ی سورەتی الشعراء) وا بەدیار دەخەن کە قورئانی پیرۆز شیعر نییە، بەڵکو پەیامی خودای گەورەیەو حەزرەتی جوبرائیل بە زمانێکی دروستو پاراو خستویەتییە دڵی پێغەمبەر(د.خ).

لە ناوەرۆکی ئەم ئایەتانە کە وەك بەدیار دەکەوێ لەگەڵ ململانێی نێوان موسوڵمانانو ناخوداياندا، لە سەرەتای بانگەشەی ئیسلامەتی دا بۆ بەرگری کردن لە موسڵمانانو پەیامی خودا هاتوونە خوارەوە.

لە ئایەتی(٥، سورەتی –الانبیأ-)دا وشەی شاعیر لە دوای نیوچە ڕستەی (أضغاث احلام بل ا فتراه ـ خەون و خەیاڵی بی سەرو بنەو بەڵکو ئیفتیرا دەکەن)و (ـ )و وشەی (بل ـ بەڵکو)ـەوە هاتووە، ئەم وشەیە(بل ـ بەڵکو) بۆ پەککخستنی ئەو مانایەی(بەقسەی قوڕەیش)کە لە ئایەتی(٤، سورەتی الانبیأ)دا هاتووە، سێ جاران دووپات بۆتەوە. پێش ئایەتی(٢٢٤، سوورەتی الشعراء) سێ ئایەتی دیکە(٢٢١تا٢٢٤) کە دەفەرمووێ: ﴿هل أنبئكم على من تنزل الشياطين* تنزل على كل أفاك أثيم* يلقون السمع واكثرهم كاذبون. والشعراء...﴾الشعراء: ٢٢١ – ٢٢٤

(ئایا پێتان بڵێم كه شه‌یتانه‌كان به سه‌ركێدا داده‌به‌زن ★ داده‌به‌زنه سه‌ر كه‌سانێكی بوختانچی و تاوانكارو گوناهكار★جادووگه‌ران گوێ له شه‌یتانه‌كان ده‌گرن و زۆربه‌یان درۆزنن ★سه‌رگه‌ردان و سه‌ر لێشێواوانیش شوێنی شاعیران ده‌كه‌ون ).

لێره‌دا روون ده‌بێته‌وه كه وشه‌ی شاعیر به‌لای كافره‌كانه‌وه وشه‌یه‌ك بووه كافره‌كان ویستوویانه له‌جیاتی(په‌یامبه‌ر)ی وه پاڵ پێغه‌مبه‌ری بده‌ن، وشه‌ی شاعیر هه‌روه‌كو وشه‌ی(مجنون، ساحر، كاهن) وه‌پاڵ پێغه‌مبه‌ر(د.خ) دراوه‌و، به‌لایانه‌وه هه‌ر ئه‌و-جنۆكه‌-یه یان(شه‌یتانه) وای له شاعیر ده‌كرد كه شیعره‌كانی به رێژنه‌و به‌گوڕ هه‌ڵڕێژێ.

له‌و چه‌ند ئایه‌ته‌ی(٢٢١، ٢٢٢، ٢٢٣ له سوره‌تی-الشعراء )دا كه باسی كه‌سانێك وه‌ك(أفّاك، أثيم) ده‌كات كه شه‌یتانیان دێته كن‌و شتیان فێر ده‌كات‌و شه‌یتان‌و شاعیر هه‌ریه‌ك شتن واده‌فامرێته‌وه، بیرو باوه‌ڕی له‌وجۆره له‌و سه‌رده‌مه‌ی عه‌ره‌بدا زۆر له باو بووه.

ئه‌و چه‌ند ئایه‌ته‌ی(٢٢٤ تا٢٢٧ی سوره‌تی-الشعراء ) باسی هه‌ندێ له‌و شاعیرانه ده‌كات كه زێده‌ڕۆیی‌و درۆو قسه‌ی نادروست‌و بێ جێ هه‌ڵده‌به‌ستن، به‌تایبه‌تی ئه‌و شاعیرانه‌ی وایان له خه‌ڵكی گه‌یاند كه ده‌توانن له‌گه‌ڵ جنۆكه‌و شه‌یتانه‌كان تێكه‌ڵ بن‌و هه‌واڵی گرنگیان له‌لای ئه‌و جنۆكانه ده‌ست ده‌كه‌وێ، ئه‌دی نابینی خوای گه‌وره ده‌رباره‌یان ده‌فه‌رموێ: ألم تر أنهم في كل وادٍ يهمون﴾الشعراء: ٢٢٥

(نابینی كه ئه‌وانه له هه‌موو دۆڵێكدا سه‌رهه‌ڵده‌ده‌ن و له هه‌موو شتێكه‌وه ده‌دوێن)

بـەمانای ئـەم جـۆرە شـاعیرانە جڵـەوی بـیرو ئەندێـشەیان رەهـا دەکـەنو بـێ پـەردەو سـڵەمینەوە لـە هـەموو ئاشـێك دەکـەنو چـیس نامالّنەوە.

قورئانی پـیرۆز لـەم جـۆرە شـاعیرانە رۆهـاتووەو هێرشـی بردوونـە سـەر نـەك شـاعیرانێك، شـیعرەکانیان پەنـدو قـسەی نەسـتەقیان لـێ وەریونو سەرمەشقی ئاکاری بەرزی مرۆڤایەتی بۆ خەڵك داداون.

ئەو ئایەتە پیرۆزەش کە سەرەتایەکەی دەفەرموێ:

﴿وما علناه الشعرَ وماينبغي له﴾[1]يس: ٦٩

(ئایەتەکانی قورئانیان بە شیعر داوەتە قەڵەم و پێغەمبەریشیان (ﷺ)بە شاعیر داناوە،بۆیە دەفەرموێت:وەنەبێ شیعرمان فێرکردبێ و ئەویش شیعری لێ قەدەغەیە،بەڵکو ئەو یادخەرەوەی رێبازی راست و درووستە).

سـنورێك لـە نێـوان شـیعری هەڵبەسـتراوی بەنـدەکانو پـەیامی پێغەمبەرایەتی دادەنێ.

ئەو چەنـد ئایەتە پیرۆزانەی باسمان کردن، بە هـیچ جۆرێـك ئـەوە ناگەیەنن کە ئایەتەکانی قورئـانی پـیرۆز لـە دژی سـەربەرزی شـیعرو شاعیران بێ، بگرە قورئان دژایـەتی هـەموو شـیعرێکی چـەوتو چـێڵ کە ناوەرۆکی وی خراپ بێت دەکات، یان بـۆ ئـازاردانی پـەیامی خـودا شاعیر بێ بڕوایی بلاّو بکاتـەوە ، قورئـان گـوێ بـەوە نـادا داخـوا ئـەو شـاعیرەی شـیعری بـەرز یـا نـزم هەڵدەبەسـتێ، کـافرە یـا موسـڵمان، ئیسلام سەیری ناوەرۆکی شیعر دەکات تا بیروباوەڕی ئاینی شاعیر..

كەسێ وا تێبگـا کـە ئـەو ئایەتانـەی لـە سـەرەوە باسمـان کـردن بەڵگەن بۆ دووفاقی نێوان قورئان‌و شیعران بە بەڵگە بێنێتەوە، ئەوە بە هەڵەدا چووە.

لــەم چــەند ئایەتــە پیرۆزانــەدا هەڵوێــستی ئــەو شــاعیرە بــێ باوەڕانـەمان بـۆ بـەدیار دەکـەوێ کـە هـەر لەگـەڵ هاتنـە خـوارەوەی پەیامی خـودا، زمـان‌و بـیرو ئەندێشەی خۆیـان بـۆ دژایـەتی پـەیامی خودا، بەتایبەتی شاعیرانی وەك:(ئەبو سوفیان، زرار کوڕی خـەتتاب، ئیبن‌و زەعبەری)تاودا.

قورئان بەهیچ جۆرێك ئازاری دەروونی ئەم شاعیرانە نادات‌و باسی شیعر بەگشتی ناکات ، بـەڵکو راسـتی ئـەو شـاعیرانە بـەدیاردەخا کـە ﴿یقولون مالایفعلون﴾ زۆر بلێ‌و نەکارەن.

لـە هـیچ ئایـەتێکی قورئانیـشدا باسـی ئـەوەی کـە قورئـان شـیعر هەڵبەستنی پاوان کردووە نەکراوە، وەلـێ پـێ لەسـەر ئـەوە دادەگـرێ کـە پێغەمبـەر(د.خ) شـاعیر نییـەو قورئـانیش فـەرموودەی خودایـەو شیعر نییە.

عەرەبەکان ئەوپەڕی شانازیان بە زمان پـاراوی خۆیانـەوە دەکـردو بە شـیعری شـاعیرەکانیان ئـەو ئەدەبـە بـەرزەیان دەگەیانـدە رەگـەزو نەتەوەکانی دیکەی دەورووبەریان.

قورئان ویستی، بۆئەوەی کەلامی پـەروەردگار لـە شـیعری شـاعیران جیـا بکرێتــەوە، لـە پـەروازی زمـان پـاراویی رشـتی بەنـدان‌و خـۆ بترازێنێ‌و بەرزتربێ.

**قورئان بەم جۆرەی کە هاتۆتە خوار دەبینین مەیدانی لە کافران خواستووە، یەکەمجار داوای لەو بێ باوەڕانە کردووە، کە فەرمووی ئەوە ئەرزوو ئەوە گەز(١٠) ئایەت لە ئایەتەکانی قورئان بێژن:**

﴿أم يقولون افتراه قل فأتوا بعشر سورة مثله مفتريات وادعوا من استطعتم من دون الله إن كنتم صادقين﴾الإسراء: ٨٨

**(پێیان بڵێ:گەر هەموو مرۆیان و پەریەکان کۆ ببنەوە و هەوڵی بەردەوام بدەن تا لە وێنەی ئەم قورئانە دابنێن و بیهێننە مەیدان هەرگیز ناتوانن کاری لەمجۆرە ئەنجام بدەن ، ئەگەر تێکراشیان پشتگیری یەکتری بکەن) .**

**ئەمەیان پێ نەکرا ئەوکاتە خوای گەورە تەنێ داوای یەك سورەتی لێ کردن:**

﴿أم يقولون افتراه قل فأتوا بسورة مثله مفتريات وادعوا من استطعتم من دون الله إن كنتم صادقين﴾هود: ١٣

**(بێباوەڕان دەڵێن : ئەم قورئانە خۆی هەلیبەستووە ،تۆش پێیان بڵێ دە ئێوەش ـ دە سوورەت ـ لە وێنەی ئەم قورئانە بێننەوە ، جگە لە خوای گەورە بەدەر هەر کێ دەتوانن بانگی بکەن بۆ هاوکاریتان پەنای بۆ ببەرن ، گەر راست دەکەن).**

**هەر بەم جۆرە لە ئایەتی(٢٣ی سورەتی-البقرە-)دا هەمان داوایان لێ دەکاتەوە، بەڵام چۆن دەتوانن.. بە تۆزی زمان پاراوی بەرپێی قورئان بن.. ئەمجارە پەروەردگار داوایان لێ دەکات کە بۆ هێنانەوەی وێنەی قورئان خۆ شەکەت کردنیان بێ سوودە:**

﴿قل لئن اجتمعت الانس والجن على ان يأتوا بمثل هذا القرآن لايأتون بمثله ولو كان بعضهم لبعض ظهيراً﴾الإسراء: ٨٨

(پێیان بڵێ:گەر هەموو مرۆیان و پەریەکان کۆ ببنەوە و هەوڵی بەردەوام بدەن تا لە وێنەی ئەم قورئانە دابنێن و بیهێننە مەیدان هەرگیز ناتوانن کاری لەمجۆرە ئەنجام بدەن ، ئەگەر تێکراشیان پشتگیری یەکتری بکەن) .

جا هەر بۆ ئەوەی کافرەکان بە هیچ جۆرێ گومانیان لەوەدا نەبێ کە قورئان فەرمودەی خودایەو قسەی هیچ بەندەیەك نییە، لەبەر ئەوە بۆ سەرجەم گەلانی جیهانی ئەوکاتەو تا کۆتایی ژیانیش پێغەمبەرێکی بێ سەوداو نا شاعیری هەڵبژارد، لەبەرهەندێ بەوپەڕی زمانپاراوی هاتۆتە خوارەوە، تا هەموو کەلە شاعیرێك‌و شیعردۆستێك بزانێ قورئان لە شیعر دوورەو قسەی بەندەی خودا نییە، هەموو ئەدەب دۆستێك ئەوە دەزانێ کە شیعر مەرجی تایبەتی خۆی هەیە ئەوکاتە پێی دەڵێن شیعر، عەروزییەکان دەڵێن جیاوازی لە نێوان عەروزو (ئیقاع) دا نییە، ئەگەر جیاوازییەکیش هەبێ هەر ئەوەندەیە کە عەرووز کات بە (تەفعیلە) بەش بەش دەکات‌و (ئیقاع) بە ترپە (دەنگ) بەش بەش دەکات، جا ئەگەر شیعر ئەو دۆستایەتییەی لەگەڵ (ئیقاع)دا هەبێ‌و (ئیقاع) یش جۆرە بەزمێکە، ئەو بەزمەش لەگەڵ هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) ناگونجێ هەروەکو پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ: من لەو بەزمە نیم‌و ئەم بەزمەش لەمن نییە: (ما أنا من دد ولا دد متی)[11]، گەلێ ڕووداوی دیرۆکیش ئەوەمان پێ دەسەلمێنێ کە ناخودایانیش دەیانزانی (محەممەد) شاعیر نییە..

وەکـو دەگێڕنـەوە:- ئەوکاتـەی بـانگوازی ئیـسلام لـە مەککـە بـڵاو بووەوە کافرەکان دەترسان نەبادا (محەممەد) کار لەو تیرانەی کـە بـۆ سەردانی (کەعبە)ی پیرۆز دێن بکاتو موسڵمانیان بکا، لەبەر ئـەوەی قـوڕەیش کۆبونەوەیـەکیان کـردو (وەلیـدی کـوڕی مـوغیرە) ئەوکاتـە گوتی: (ئەگەرـ محەممەد ـ قسەی لەگەڵ وەفدی ئـەم تیرانـەی کـە بـۆ سەردانی کەعبە دێن کرد، ئێوە چ دەڵێن؟.. گوتیـان دەڵـێین (شـێتە)، (وەلیـد) گـوتی: جـا خـەڵکی قـسەی لەگـەڵ دەکـەنو دەزانـن کـە ئـەم قسانە قسەی شـێت نـین، ئـەمجار گوتیـان دەڵـێین (شـاعیرە).. وەلیـد گوتی:لە نـاو ئـەم تیرانـەدا شـاعیری چـاك هەیـەو دەزانـن ئـەو قـسانە شیعر نین وقورئانیش لە شیعر ناچیٚ، ئەوسا گوتیان ئـەی باشـە چـی بڵێین؟ ،دوای نەختێ بیرکردنەوە، وەلید گوتی:دەڵێین: (جادوو بازە).

﴿إنه فكرّ وقدر فقتل كيف قدر ثم قتل كيف قدر ثم نظر ثم عبس وبصر ثم أدبر واستكبر فقال إن هذا إلا سحر يؤثر﴾: المدثر ١٨ ــ ٢٤

(بیری کردەوەو پەیامەکەی بە هەڵە هەڵسەنگاند ★ ئەمە چۆن هەڵسەنگاندنێك بوو هەی بە کوشت چیٚ★پاشان بەکوشت چیٚ خۆی و هەڵسەنگاندنەکەی★دواتر سەیری دەوروبەری خۆی کرد★ئەوسا نێوچاوی هێنایەوە یەك و رووی خۆی ناشیرین کرد★پاشان رووی وەرگێڕاو خۆی بە زلزانی★ووتی: ئەم قورئانە جادوویێکەو لە کەسی دیکەوە وەرگیراوە).

دەگێڕنەوە:

(هۆی موسڵمان بوونی(ئەبو زەری غەفاری) ئەوە بوو کە جارێکیان (ئەنـەس) ی بـرای دەچـێتە سـەردانی مەکـە کـە دەگەڕێتـەوە (ئـەبو

زەر) پێـی دەڵـێ: مەککـە چـۆن بـوو؟ ئـەمیش دەڵـێ: پیـاوێکم دیـت دەیگوت خوا منی بۆ ئێوە ناردووەو خـەڵکیش دەیـان گـوت: شـاعیرەو جادوبازە، پاشان (ئـەبو زەر) گوتی: (ئەنـەس) خـۆ تـۆ شـاعیری چی دەڵێیـت؟ ئـەمیش گـوتی: بـە خـودا هـیچ شـاعیرێك نـاتوانێ قـسەکانی(محەممـەد) بکـات بـە شـیعر، بـەخودا (محەممـەد) راسـت دەکاتو قورەیش درۆ دەکەن)[٤].

لەسەر زاری(وەلیدی کوڕی عوقبە)ی دەگێڕنەوە:

(کاتێ دەچێتە لای پێغەمبەر (د.خ) و پێی دەڵـێ چیت هەیـە بـۆم بخوێنیتەوە؟

ئەم ئایەتەی بۆ دەخوێنێتەوە:

﴿إن الله يأمركم بالعدل والاحسان وإيتاء ذی القربی﴾النحل: ٩٠

(بەراستی خوا فەرمان دەدات بە داد پەروەری و چاکەکاری و یارمەتی دان و بەخشندەیی بەرامبەر خزمان و گوناه و تاوان و دەستدرێژی بۆ سەر ماڵ و نەفس و ناموسی یەکتری قەدەغە دەکات و ئامۆژگاریتان دەکات بەڵکو تێبفکرن و چاکە بکەن).

(وەلید چەند جارێك ئـەم ئایەتـەی پـێ دووبـارە دەکاتـەوە پاشـان دەڵێ:

هـیچ قـسەیەکم لـەم قـسانە پـاراوترو رەوان‌و شـیرینتر نەبیستووە)[٥].

گـەلێ ئایـەتی دیکـە بـە بۆنـەی رووداوەکـانی مەدینـەوە بـۆ پـەرچ دانـەوەی کـافران‌و جوەکـانی ئـەو شـارە لـەکاتی دەگـەڵ شـاعیرە بـت پەرست‌و گاورو جولەکاندا رووبەڕوو بونەوە هاتنە خوارەوە.

(کەعبی کوڕی ئەشـرەف) کـە شـاعیرێکی (جـوو) بـوو هـەموو بـیرو ئەندێشەی خۆی بۆ هەڵبەستنی قسەی خـراپ دەربـارەی پێغەمبـەرو پـــەیامی خـــودا خـــستبوە گـــەڕ، ئەمـــەش ئـــەوە دەگەیـــەنێ کـــە پێغەمبـەر(د.خ) بـە هـەموو جـۆرە چـەکێکەوە روبـەڕووی دوژمنـی جوراوجۆری زۆر دەبووەوە.

شیعر لـە گۆڕەپـانی جەنگدا چالاکانە کـاری خـۆی دەکـرد، لەگـەڵ ئەوەشدا شەڕوشۆڕ بۆ شیعرو لەسەر شـیعر نـەبوو شـیعریش بابـەتی سەرەکی ئەو ململانێیە نەبوو، بەڵکو ململانێ لەسـەر قورئـان بـوو و بە بۆنەی ئەوەوە بوو.

قورئـان تـوانی رادەی زمـان پـاراوی لـە توانـست بـەدەری شـیعر هۆنینـەوە لـە ئاسـتێ رابگرێـتو، بـۆ هـەموو عەرەبـستانی ئەوکاتـەو پاشانیش بەسەر لەبەری گەلانی جیهانی سەلماند کە قـسەو وشـەکانی قورئان لە ئاستێکی بەرزی زمانپاراویدایەو ئەو بە خـەڵك دەسـەلمێنێ کە قسەی مرۆ نییەو شیعری ناگاتێ.

پاشان لە پاڵ ئەو ململانێیـەی کـە شـاعیرانی بـێ بـاوەڕ خۆیـان بـۆ سـازدا لـەو کاتـەی شـیعری بانگـەوازی ئیـسلامەتی هاتـە گـۆڕێو لـە گۆڕەپــانی ململانێیەکــەدا وەکــو شۆڕەســوارێکی چــاك بەرپەرچــی شیعری بێ باوەڕانی دەدایەوە، پێغەمبەری مەزن بـە هـیچ شـێوەیەك نەیدەویست بە تەرزی شیعری وەڵامی شاعیرە بێ باوەڕەکان بداتەوە، چـونکە بـەلای ئـەوەوە قورئـان بـۆ بەرپـەرچ دانـەوەی هـەموو بـێ باوەڕیێك بەسەروبەر بوو و لێشی زیاد بوو، زۆرجـاران کـە بـە شـیعر هەڵی دەکوترایە سەرو بە شیعر چاوەنواڕی وەڵامدانەوەی بوون، هەر

بۆ ئـەوەی نـاوو نـاتۆرەی شاعیریەتی وەپـاڵ بـدەن، ئـەو دەیفـەرموو: ﴿کاری مـن ئەوەیـە پـەیامی خـوا بـڵاو بکەمـەوە نـەك شـیعر بڵـێمو لەناو ئێوەدا خۆمی پێ هەڵکێشم)

جارێکیـــان وەفـــدێکی(بـــەنی تـــەمیم)ی هاتـــە لا بـــە سـەرۆکایەتی(زەبرقـان کـوڕی بـەدر) کـە شـاعیرێکی ئـەم هـۆز بـوو لەخزمەتیـدا دەسـتی بـە شـیعر خوێندنـەوە کـرد، پاشـان ئـەوانیش داوایـان لـە پێغەمبـەر(د.خ) کـرد کـە ئـەویش شـیعریان بـۆ بڵـێ، پێغەمبـەر(د.خ) دیـسان فـەرمووی: (مـن بـۆ شـیعر گـوتن رەوانـە نەکراومو نەهاتوم بەسـەر خەڵکیـدا خـۆم هەڵبکێـشم.. بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا گوێ لە شیعرەکانتان دەگرم) [٦].

ململانێ دژی هەموو شیعرێ نەبوو بەڵکو دژی جۆرە شیعرێك بوو کـــە دوژمنـــانی ئیـــسلام بـــۆ دژایـــەتی موســـڵمانانو ئـــازاردانی پێغەمبەر(د.خ) دەستنیشانیان دەکرد.

★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★

## هەڵوێستی پێغەمبەر(د.خ) بەرامبەر شیعرو شاعیران

بانگەوازی ئیسلام بەنهێنی دەستی پێ کردو سێ ساڵانی خایاندو پێغەمبەرو موسڵمانان لە(دار الارقم) کۆ دەبونەوە، هەر لەوێش سەروکاری لەگەڵ یارویاوەرانی دەرەوەش گەرمتر دەکرد.

لەوکاتانەدا ئیسلام بەتایبەتی لە رووی بیرو باوەڕو لێکدانو ئاوەزەوە رووبەڕووی کافرەکان نەبووبووەوە، هەر لەو کاتانەشدا بوو زمانی هەندێ لەو شاعیرانەی خاوەن باوەڕ بوونو رێگەیان بۆ بانگەوازی ئیسلام خۆش دەکرد، بۆ نموونە وەکو(ئومەییەی کوڕی ئەبی سەلت)و (وەرەقەی کوڕی نەوفەل)و (زەیدی کوڕی عەمر) بە شیعری ئایینی و سیاسی ئامێز پژاو بلاّو بۆوە.

هەر لەبەر هەندێش کە بانگەوازەکە ئاشکرا بوو قورەیشییەکان دەستیان بە هەڵپەو جرتوفرتان کرد بۆ دژایەتی پەیامەکەی پێغەمبەر(د.خ)و هەوڵیاندا هەر لە سەرەتاوە بیتاسێنن.

دوای ئەوەی هەوڵێکی زۆریان داو ئەوەیان بۆ بەسەر نەچوو، نەیانتوانی ئەم بیرو باوەڕە نوێیە لەناو بەرن.. ئەمجارە هەوڵیاندا بە جۆرێکی دیکە زیندە بەچاڵی بکەن، لەوەڕا نەخشەکەیان گۆڕیو لەگەڵ ئەبو تاڵیب کردیانە بێنەوبەردەو داوایان لێکرد لە جیاتی وی (عماری کوڕی وەلید)ی برازای بکات بە کوڕی خۆیو واز لە پشتگیری برازاکەی بهێنێ.. بەلاّم (ئەبوتالیب) ئەوە داوایەی رەتکردەوەو سەرومرڕبوو لە پشتگیری کردنی پێغەمبەر(د.خ).

لەوکاتەدا چەند ئایەتێك بۆ دڵنیاکردنی پێغەمبەر(د.خ) هاتنە خوارەوە:

﴿وقل اني أنا النذير المبين، كما أنزلنا على المقتسمين، الذين جعلوا القرآن عضين فوربك لنسئلنهم أجمعين. عمّا كانوا يعملون﴾(١) الحجر: ٨٩ ــ ٩٣

**( بلێ كه من بێدارخەرەوەيەكی ئاشكراو ديارم و گەر سەركەشی بكەن ئەوە ئه نجامێكی ترسناك چاوەڕێتانه*بۆ جولەكەو گاورانيش كتێبمان دابەزاندووە ،بەلاّم بەش بەشيانكرد و بەشی زۆريان دەسكاری كردووە*ئەوانەی كه رايان دەربارەی قورئان جۆراو جۆرە ، باوەڕبه هەندێكيان دەهێنن و هەندێكيش ناچێته مێشكيانەوە *سوێند بە پەروەردیگارت لە هەموويان دەپرسينەوە و لە بيرو باوەڕيان دەكۆڵينەوە*له كارو كردەوەكانيشيان دەپرسينەوە ).**

ئـەبو تـاڵيبيش بـه شـيعر وەڵامـی قوڕەيـشييه بـێ باوەڕەكـانی دەدايەوە، سەرەڕای وەی كە ئـەو هەڵوێستەی كـافرانيش ديـسان هـەر سـوودی بۆيـان نـەبوو، ئەوسـا هـاتن داوای بەڵگـەی بـەهێزی پێغەمبەرايەتيان لە (محەمەد، د.خ) كرد بۆ ئەمەش خوای گەورە بـه چەند ئايەتێكی پيرۆز وەڵامی دانەوە:-

﴿ولو ان قرآناً سيرت به الجبال اوقطعت به الارض او كلم به الموتى بل لله الامر جميعاً الم يأيس الذين آمنوا ان لو يشاء الله لهدى الناس جميعاً ولايزال الذين كفروا تصيبهم بما صنعوا قارعة او تحل قريباً من دارهم حتى يأتي وعدالله ان الله لايخلف الميعاد﴾(١)الرعد: ٣١

(گـەر لـە جيـاتی ئـەم قورئانـە خـودا قورئـانێكی رەوانـە بكردايـەو كێوەكان پێی برۆشـتنايه يـان زەوی پێـی هەڵكەنرايـە يـان مـردووی پێ بهاتايه قسه ، خوانەناسان هەر بڕوايان نەدەكرد ، بلاّم دڵنيا بن كه هەموو شتێك بە دەست خودايە ،باشه ئايا ئيمانـداران ناهومێـد نەبوون لـە خـوا نەناسان كـە هيدايـەت بـه زۆری نيـه ، گـەر خـودا بيويستايه هيدايەتی بە هەموو خەڵكی دەدا ، ئەوانە وەنەبێ ژيانی دونيـا بـە خۆشـی بـەر نەسـەر ، بـەڵكو ئـەم بێباوەڕانـە بـەردەوام بـەهۆی كـردەوە خراپـەكانيان تووشـی ناخۆشـی دەبـن ، تـا لـە نـاو

ماڵـەکانتان و وڵاتـەکانتان بـەڵێنی خـودا بەسـەرکەوتنی ئاینەکـەی دێتە دی و خوداش بەڵێنی خۆی هەر دەباتە سەر).

دیـسان بـێ بـاوەڕان ڕێگایـەکی دیکـەیان بـۆ ئـازاردانی موسـڵمانان وەبەرگرت، ئەویش ئەو گەمارۆ وەرزەکییە بوو کە پێغەمبەری ناچار کـرد بـەرەو مەدینــە ڕەو بفـەرمووێ.. ئــەو ڕەوەی کـە روخـساری دیرۆکی گۆڕی و سیستم (نیزام) ـێکی پاكو خاوێنی تازەو نوێ بـاوی جیهانگیری، کە لەسەر بنەمای بڕوا بە تاکە خودایـەکی تـەنها لەسـەر دادو برایـەتی و میهرەبـانیو خۆشەویـستی نێـوان بەنـدەکانی خـودا دامەزرا هێنایە گۆڕێ.

دوای پایــەداربوونی موسـڵمانان لـە مەدینــە، زۆری نەکێـشا شــەڕ دەســەوبەرۆکی هــەردوولا بــۆوە، ئەمــەش لەوکاتــەوەبوو کــە دوای (عەقەبەی دووەم) قوڕەیشییەکان کە بـۆ سـەردانی کەعبـە هاتبوونـە مەککــە وەدوو (ئەنــسار)ەکـان کــەوتنو (ســەعدی کــوڕی عبــادە و مونزری کوڕی عومەر) یان بینی، توانیـان (سـەعد) دەسـتگیر بکـەنو (منذر) رای کرد.

ئەوسـا شـاعیری قـوڕەیش (زرارکـوڕی خـەتتاب) بـە چـەند دێـڕە شیعرێك شانازی بە گرتنی (سەعد) کرد کە هەر لە سـەرەتاوە دەڵـێ: (تـداركت سـعداً فأخذتـه ، وكـان شـفاءاً لوتـداركت منـذراً- دەسـت و بردێکم کردو سەعدم گرت،بە تەواوی بـە گرتنـی مـونزر دڵـم سارێژ دەبوو) پاشـان (حـسان کـوڕی سـابت)یـش بـە چـەند دێـڕە شـیعرێکی توندوتیژ وەڵامی دایەوە: فأنا ومـن يهـدي القـصائد نحونـا كمستبـضع تمراً أهل خبيرا + فلا تلك كالوسنان يحلم انه + بقرية كسرى او بقرية

قیصرا ــ من و ئەو کەسەی کە چامەکانیمان پێشکەش دەکات ، وەك ئـەو کەسـە وایـە کـە خورمـا بـە خـەڵکی خەیبـەر دەفرۆشـێت +وەك خەواڵوێك مەبە کاتێ خـەو دەبێنـێ وادەزانـێ لـە دێیەکـەی کیـسرا و قەیسەرە.)[٧]

هەر ئەوکاتەی موسڵمانان لە مەدینـە ریـشاژۆ بـوونو دەسـتیان بـە رێکخـستنی کۆمەڵگـەی ئیـسلامیو دامەزرانـدنی بناغـەی دەوڵـەتی نــویێو پێکهێنــانی کەلــە پیــاوی ئــاین پــەروەرو سیاســەتمەدارو ســەرکردەی لەشــکر کــرد. پاشــان هــەوڵی لــەبن نــەهاتوویان، بــۆ دامەزرانـدنی سـنوورێك کـە مەدینـەی پـێ بپـارێزنو ئـەوجا دەسـت پێکرانی جەنگی بەدری گەورە، شەڕی نێوان هەردوولایان، شیعر لـەو هــەموو گۆڕانکارییانــە بــەردەوام ئامــادەی ئــەم گۆڕانکاریانــەبوو و بەرهــەمو رەنگدانــەوەی ئــەم گۆڕانکارییانــە بــوو ئەگــەر لــە دیوانەکـەی(حـسان کـوڕی سابت) ووردبینـەوە ئـەو راسـتیانەمان بـۆ بــەدەر دەکــەوێ کــە(حــسان) پــێ بــەپێ شــیعری لەگــەڵ هــەموو هەنگاوێکی ئەم گۆڕانکارییانەدا گوتووە٠

(حــسان) چــەندان شــیعری دیکــەی لــە بــارەی خۆشەویــستی پێغەمبەرمان داناوە ٠

هەر لەو کاتەدا شاعیرانی قوڕەیـشی(أبـو عـزە، هیـبیرە کـوڕی ئـەبو وەهــەب، ئیبنــو زەعبــەری)و شــاعیری جولەکــەکان(کــەعب کــوڕی ئەشرەف) لەگەڵ(حسان)دا بەردەوام لە شەڕە شیعر دابوون.

قوڕیـشییەکان کۆمــەڵێ شـاعیری خۆیـان بـۆ لاواز کردنـی هێـزی پڕتـەوی بانگـەوازی ئیـسلامەتی هـان دان، هـەروەها بـۆ بەرپـەرچ

دانەوەی ئەم کۆمەڵە شاعیرە بێ باوەڕانە، موسڵمانەکانیش کۆمەڵێ شاعیری لێهاتووی خۆیان هان دا، بەڵام دوای ماوەیەك بتپەرستان بۆیان بەدیار کەوت کە گەلێ لە شاعیرەکانیان وا خەریکن دەبن بە موسڵمانو دەچنە ریز ئیماندارانەوە، بۆئەمە گەلێ پولوپارەو خەڵاتیان بۆ شاعیرەکانیان تاکو نەچنە ریزی موسڵمانانەوە تەرخان کرد، بۆ نموونە (ئەبو سوفیان) خەڵاتێکی باشی بە شاعیری ناودار (ئەعشا) تا دڵی بەلای موسڵماناندا نەچێ بەخشی.

پێغەمبەرمان رێزێکی زۆری لە شاعیرە ئیماندارەکان گرتووە، نرخو بەهایەکی زۆری لە شیعرەکانیان ناوە هەروەکو لێرەدا دەفەرمووێ: (ئیماندار بە شیعرو زمانەکەی جیهاد دەکات.. بەو خوایەی منی بەدەستە شیعرەکانی ئێوە لە تیرەکان بەهێزترن.

هەرجارێك پێغەمبەرمان(کەعبی کوڕی زوهێر)ی دیتبا کەوایەکەی وەسەرشانی خۆی دەخستە سەرشانی ئەو کە ئەویش نیشانەی رێز لێ گرتنی بوو. )[٨]

ئەوەندەی حەزی لە شیعرەکانی(زەید الخیل-لە دایك بووی ٩هـ/٦٣٠ز) دەکرد، تەنانەت ناوی(زید الخیر)ی ناونابوو، بگرە دەربارەی ئەو شاعیرە دەی فەرمو(ئەو شیعرانەی کە زەید لە سەردەمی نەزانی دا هەڵی دەبەستن.. هەر دەڵێی ئیمڕۆ بۆ ئیسلامەتی هەڵبەستراون.)[٩]

لەمەڕ(عەنتەر)ی شاعیر دەیفەرموو:(لەو شاعیرانەی بۆیان باس کردووم کەسم ئەوەندەی عەنتەر حەز بە بینینی نەکردووە). [١٠]

دەربارەی(لبیدی کوڕی رەبیع) دەیفەرموو: (راستترین شیعرێ کە تائێستا شاعیرێ داینابێ شیعری(لبید)ە کە دەڵێ:

(الا کل شئ ما خلا الله باطل ، وکل نعیم لامحالة زائل) (١١)

(هەموو شتێ بێ بوونی ویستی خودا پوچەو هەموو خۆشەویستییەکیش تاسەرنییە) کاتێکیش کە گوێی پیرۆزی لەو شیعرەی(تورفە کوڕی عەبد) بوو کە دەڵێ:

(ستبدي لك ألايام- رۆژان بۆت بەدیار دەکەون) فەرمووی ئەم شیعرانە لە قسەی پێغەمبەران دەچن.) (١٢)

هەروەها دوعای خێری بۆ (نابغەی جەعدی) دەکردو دەی فەرموو(خودا دەمت نەڕزێنێ) (١٣)

پێغەمبەر(د.خ) هەوڵی دەدا شاعیرە ئیماندارو خودا پەرستو راستگۆیەکانی لەخۆی نزیك بکاتەوە، داوای لێ دەکردن، بۆ سەرفرازی ئیسلامو بەرگری لە هێرشی دوژمنان شیعری بەهێزو پێزو راستورەوان بهۆننەوە، جا هەر بەهۆی ئەم گرنگی بە شیعرو شاعیران دانەبوو، کە لە دوارۆژدا بوون بە زمانحاڵی بانگەوازی ئیسلامی، هەر شاعیرەی مەیدانی خۆی هەبوو و بۆ رووبەڕوو بوونێکی تایبەتی سازدەدا؛ بە نموونە بە (عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە)ی دەفەرموو (أنت شاعر کریم- تۆ شاعیرێکی بەرزو بەخشندەی) (١٤)

بە(کەعب کوڕی مالیك)ی دەفەرموو: (أنت تحسن صفه الحرب- تۆ بابەتی شەڕ باش دەزانی(١٥)

دەگێڕنەوە جارێکیان موسڵمانان بە دەوری کەعبەدا دەسوڕانەوە، لەو کاتەدا (عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە) دەستی بە شیعر گوتن کرد.. (عومەری کوڕی خەتتاب)یش رووی تێ کرد، گوتی (کوڕی ڕەواحە) لە حەرەمی پیرۆزو لە بەردەم پێغەمبەر(د.خ)دا، شیعر دەڵێی؟ پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی: (لێی گەڕێ عومەر شیعرەکانی لە شیرو تیران کاریگەرترن) [16]

(البراء) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر(د.خ) ڕۆژی (قریضة)بە (حسان)ی فەرموو (أهج المشرکین فأن جبرائیل معك- ڕووبەڕووی کافران بوەستە جوبرائیل لەگەڵتایە.) [17]

(عائیشە ر.خ) دەڵێ: پێغەمبەر(د.خ) لە مزگەوت سەکۆیەکی بۆ(حسان) دانابوو شیعری لەسەر دەخوێندەوە، هەمووجارێکیش دەی فەرموو: (خودا لەگەڵتایەو فریشتەکان پشتگیریت دەکەن) [18]

پێغەمبەر(د.خ) (حسان)ی دەنارده لای (ئەبو بەکری صدیق) تا بیرو ئەندێشەو هۆشی فراوانتر بکاتو داستانی ڕووداوەکانی کۆنی عەرەبستانی فێربکاتو زانیاری پتەوتر بکات) [19]

(عەمرو کوڕی شەدید) لە باوکی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: جارێکیان لە دوای پێغەمبەر(د.خ) دەرۆیشتم فەرمووی: گەلۆ هیچ شیعرێکی(ئومەییەی کوڕی ئەبو سەلت)ت لەبەرە؟

گوتم: بەڵێ.. فەرمووی بیخوێنە.. دەڵێ.. دێڕە شیعرێکم بۆ خوێندەوە دیسان فەرمووی بەردەوام بە، (باوکی عەمرو) دەڵێ: سەد دێڕم بۆ خوێندەوە کاتێ گوێی پیرۆزی بەم دێڕە زرینگایەوە کە دەڵێ: (الحمدلله ممساناً ومصبحاً بالخير صبَّحنا ربی ومسَّانا)

(شوكرو سوپاس بۆ ئەو خودایەی ئێوارەو بەیانیمان بەخێرو بێر بۆ دەكاتەوە خوای گەورە بەیانی بۆ كردینەوەو ئێوارەی بۆ داهێناین)

فەرمووی: (ئومەییە شیعرەكانی باوەڕیان هێناوە ، بەلاّم خۆی هەر بێ باوەڕە.. چونكە ئومەییە باوەڕی تەواوی نەهێنا) [٢٠]

(جابر كوڕی سەمرە) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: زیاتر لە سەد جار لای پێغەمبەر(د.خ) دانیشتبوم.. یارانی باسی زەمانی جەهالەتو شیعرەكانیان دەكردو پێغەمبەر(د.خ) گوێی بۆ رادەداشتن‌و ناوبەناویش بە بزەیەكی سەرلێو بەشداری دەكردن)[٢٠]

هەروەها پێغەمبەر(د.خ) رێزێكی تایبەتی لە(الخنساء)ی شاعیر دەنا، هەر ئەم رێزە تایبەتیەش بوو كە بوو بە مایەی ئەوەی ئەم شاعیرە، ئیسلامی لە خۆی و براو هەرچوار كوڕەكەی زیاتر خۆش بوێ،

پێغەمبەر(د.خ) دەربارەی(زەیدی كوڕی عومەر) دەیفەرموو: (وەكو نەتەوەیەك رۆژی قیامەت زیندوو دەبێتەوە.).[٣١]

## هەڵوێستی یارانی پێغەمبەر( د.خ ) بەرامبەر شیعرو شاعیران

هەڵوێستی یارانی پێغەمبەر(د.خ) جیاوازییەكی ئەوتۆی لەگەڵ هەڵوێستی قورئان‌و پێغەمبەردانییە.. بەتایبەتی هەرچوار یارەكەی —ئەبوبەكرو عومەرو عوسمان‌و عەلی- خودا لێیان رازی بێت.. حەزیان لە شیعر بووەو شیعری زۆریشیان لەبەر بووە،

ئەبوبەکر(ر.خ) لەگەڵ ئەم هونەرەدا زۆر هاوسەروکار بووە، شیعری لەبەر دەکردو دەشی هۆنیەوە.. زۆربەی شیعرەکانیشی لە ستایشی پێغەمبەر(د.خ)دا هۆنیویەتییەوە ٠

(عومەر کوڕی خەتتاب) یش لە هەموو کەسێ زیاتر حەزی لە شیعر بوو و گرنگی بە رەخنەو گێڕانەوەی شیعر دەدا، بگرە لە هەر بۆنەیەكو گفتوگۆیەکدا(عومەر ر.خ) شیعرێکی دەربارەی دەگوت.[٢٢]

(عومەر)رای خۆی دەربارەی گەڵێ شاعیران دەردەبڕی، دەربارەی (امرئ القیس) دەڵێ: (سابق الشعراء خسف لهم عین الشعر - لەو شاعیرە پێشەنگانەیە کە چاوی شیعریان بۆ رۆچووە.)[٢٣]

زۆرجاران داوای لە (ئەبو موسای ئەشعەری) دەکرد، منداڵان فێرە هونەرەکانی شیعر بکات... دەیگوت: شیعر رەوشتی بەرز فێری مرۆڤ دەکات.

تابڵێی بە شیعرەکانی(زوهێر کوڕی ئەبو سەلما) سەرسام بوو و ناوی(دادوەری شاعیران)ی بە بالاّ بڕی بوو، بەلای عومەرەوە(زوهێر) باشترین شاعیری جاهیلی بوو، چونکە شیعرەکانی راستو رەوانو فرەئاکارو رەوشت بەرز ئامێز بوونو بەکەسی ڕا هەڵنەدەگوت کە شیاوی پێدا هەلگوتن نەبوایە،[٢٤] لەگەڵ ئەوەشدا(زوهێر)باوەڕی بە رۆژی زیندووبوونەوە هەبوو و لە شیعرەکانیدا ئاماژەی بۆ دەکرد بۆ نموونە:-

(یؤخر فیودع في کتاب فیدخر ، لیوم الحساب أو یعجل فینقم.)[٢٥]

(لەم دێڕ شیعرەدا باسی رەفتارەکانی مرۆ دەکا کە لە دەفتەردا دەنووسرێ‌و بۆ لێپرسینەوە و لێ پێچانەوە هەڵدەگیرێ..)

(عومەر ر.خ) کاتێ بە(لبید کوڕی رەبیعە)ی گوت بۆچی لەوەتەی موسڵمان بووی شیعرەکانت نابیستین ئەمیش لە وەڵامدا گوتی خودای گەورە لەجیاتی شیعر سورەتی(البقرة و آل عمران)ی پێ بەخشیوم ئەوسا عومەر(ر.خ) خەڵاتێکی باشی کرد)[٢٦]

(عومەر ر.خ) شیعریشی دەهۆنیەوە.. لە رزگارکردنی(مەککە)دا ئەم شیعرەی خۆی دەخوێندەوە:

(ألم تر أن الله أظهر دينه ، على كل دين ذلك حائد)[٢٧]

(نابینی کەخوای گەورە ئاینی خۆی دەر خست و بەسەر هەموو دینانـدا زاڵی کرد) عومەر (ر.خ) چەندەی شاعیری باش‌و بەرزی خۆش دەویست ئەوەندەش رِق‌و قینی لە شاعیری ئاکار پەرست‌و بوودەڵە دەبۆوە.

(عوسمانی کوڕی عەفان‌وعەلی کوڕی ئەبو تاڵیب)یش تابڵێی شیعر دۆست بوون بەتایبەتی(عەلی ر.خ) شیعر دۆست‌و رەخنەگری سەردەمی خۆی بوو و شیعریشی دەهۆنیەوە بۆنموونە لە کاتی دروستکردنی یەکەم مزگەوت لە مەدینە دەی گوت:

(لايستوى من يعمر المساجد ، يدأب فيه قائيماً وقاعيداً،ومن يرى عن الغبار حائدا

(ئەوەی ماڵی خودا درووست دەکات وبەردەوام نوێژو خواپەرستی تیادا دەکات ،یەکسان نین....)، دەڵێن هەموو جارێ(عەممارِی کوڕی یاسر) ئەم شیعرەی دووبارەو چەند بارە دەکردەوە)[٢٨]

## ئەم هەڵوێستانە لە دیدی هەندی لێوەتوێژان:

لەگەڵ ئـەم هـەموو ئایـەتو فـەرموودەو قـسەی یـارانی پێغەمبـەر (د.خ)دا دەبیـنین، زانایـانی رشـتەی ئـەدەبیاتو زۆر لـە لێوەتوێـژان، هەریـەك بـە جـۆرێ لێکیـان دەدەنـەوەو هەریـەك بەشـێوەیێ لێیـان تێدەگەن هەندێك لەو لێوەتوێژانە لەو باوەڕەدان کە قورئـانی پـیرۆز بـە چـاوێکی باشـەوە سـەیری شـیعرو شـاعیران دەکـا، ئـەم بیروڕایـە هەلوێستی لێوەتوێژانی ئـەدەبیات (یحـی الجبـوری و د.محمـد فتـوح و د.بنت الشاطئ و د.شوقي ضیف) ـە.

(یحی الجبوری) دەربارەی ئەم مەسەلەیە دەڵێ: (هەلوێستی ئیسلام لـە ئاسـت شـیعردا بـاش بـووەو هـەوڵی داوە شـیعری بـەرزو رەسـەنو راستگۆ بێنێتە ناو ئەدەبی عەرەبییەوە)[29]

هەروەها (د.محمد فتوح أحمـد) دەڵێ: (ئیـسلام لـە نیگـای وەی کـە بانگەوازە، لە نیگای وەی هونەرە دژی شیعر نەوەستاوە، بەڵکو تەنها جـۆرە شـیعرێکی رەتکردۆتـەوە کـە دەرگـای خراپـەو بەدرەوشـتی دەخاتە سەر گازی پشتو بەرگری لە بێ باوەڕی دەکات.)[30]

(د. بنـت الـشاطئ) هـەمان هەلوێـستی هەیـەو دەڵـێ: (راسـتی بۆچوونی من لەوەدایە کە قەت شیعر لە هەماهەنگی ژیانی رۆژانـەی موسڵمانان تەریكو پێوار نەبووە).[31]

هـەروەها (د. شـوقی ضـیف) لـە (کتێبەکەیـدا)[32] کـە رای خـۆی دەربارەی شیعر دەربڕیووە، هەمان هەڵوێست نیشان دەدات.

کۆمـەڵێکی دی لـە لێوەتوێـژان بـەجۆرێکی دی سـەیری ئـەو مەسەلەیە دەکەن، (د.أحمد حسن الزیات) دەڵێ: سەبارەت بـەوەی کە

ئیسلام هێرشی بۆ سەر شیعرو شاعیران بردووە، خەڵك لە شیعر دوور کەوتوونەتەوە.)[٣٣]

(زەکی موبارەك)یش دەڵێ: (ئەو هەڵمەتەی کرایە سەر شیعر وای لە موسڵمانان کرد چەنانێك لە شیعر بپڕینگێنەوە، هەر لەو سۆنگەوەش خەڵك وایان دەزانی زانایانی ئاینی نابێ نزیکی شیعر بکەونەوە)[٣٤]

هەردوو رایەکەی ئەم دوو زانایە لە هەموو لایەکەوە هێرشیان وەسەر کراو بە ڕایەکی بێ بەڵگەو پووچ لە قەڵەم دران، بەلای زۆر لە ئەدەب دۆستانەوە ئەو دوو نوسراوە بە هەڵە سوورەتی (الشعراء)یان لێك داوەتەوە.. ئەوەیان لەبیر چۆتەوە کە زۆر لەوانەی قورئانیان وەکۆڵیووە لەو باوەڕەدان کە قورئان تەنها هێرش بۆ سەر ئەو شاعیرانەی، بەرگریان لە بت پەرستی و پشتگیری بێ باوەڕیان دەکرد، بردووە...(زۆریش لەم شاعیرانە پاشانەکێ باوەڕیان بە ئاینی ئیسلام هێنا.. هەندێکیشیان هەر لەسەر بێ باوەڕی خۆیان مانەوە.. ئەم شاعیرانەش (الاسود بن جعفر، أبی سوفیان، زرار کوڕی خەتتاب، ئەب عزە، ئومەییە کوڕی ئەبو سەلت، حوتەیئە)... بوون[٣٥]

**********************************

---

************************************************************

************

## تێزی لاوازی شیعر لە سەردەمی سەرەتاکانی ئیسلامدا:

تێزی لاوازی شیعر لە سەرەتای پەیدابوونی ئیسلامەتیدا لەناو ئەو کەسانەدا، کە سەرقاڵی خوێندنەوەی نووسینەکانی (الاصمعی و ئیبن سەلام‌و ئیبن خەلدون) بوون‌و کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەو راوبۆچوونەیان سەری هەڵدا کە دەربارەی شیعر چەند لێوەتوێژینێکیان ئەنجامدابوو.

دەربارەی لاوازی شیعر، (الاصمعی) دەڵێ: (کەڵە شاعیرانی وەك أمرئ القیس و زوهێر کوڕی ئەبو سەلما و نابیغە)، کە لە دەریاکانی شیعردا بە سوارچاکی و کۆچ‌وکۆچباری‌و پیاهەڵدان باس کردن، یان بە ئافرەتدا هەلگوتن رۆچوون، لەناو ئەو دەریا قوڵانەدا وەمەلە کەوتوون‌و لە بیابانی پان‌و بەرینی ئەندێشەوە ئەسپی کوێتی خۆیان تاوداوە، بەڵام کە

شاعیرێك خۆی لەو هەموو باسانە لادەدات‌و دێت باسی کۆچی دوایی پێغەمبەر(د.خ)و شەهید بوونی (هەمزەو جەعفەر) دەکات، شیعرەکەی هێزو پێزی خۆی لەدەست دەدات.)[٣٦]

(ئیبن سەلام) لەوبارەیەوە دەڵێت: (ئەوکاتەی رێبازی ئیسلام هاتە ناو کۆڕی ژیانی مرۆییەوە، موسڵمانان لەبەر سەرقاڵی جیهادو شەڕی گەورەی فارس‌و ڕۆم لە گۆڕەپانی شیعر هەڵبەستندا نەختێ رەوینەوە، بەڵام دوای ئەوە موسڵمانان جێگیر بوون‌و غەزاو

غەزاكاريان كەم بووەوە دەستيان بە شيعر هۆنينەوە كردەوەو خۆيان دايەوە شيعر، بەڵام بەهۆى لەناوچوونى زۆرى شيعر دۆستانێ كە شيعرى زۆريان لەبەر بوو، لە شەڕەكاندا زۆر شيعرى نايابيش لەناوچوون.)[٢٧]

هەندێ لە لێوەتوێژان بەم جۆرە. ئەو بۆچوونەى (ئيبن سەلام) هەڵدەسەنگێنن‌و دەڵێن: (ئەم بۆچوونەى(ئيبن سەلام) دوو مەزەندەى لێ دەكەوێتەوە:-

يەكەم: هۆى دووركەوتنەوەى موسڵمانان لە دەوروبەرى شيعر ئەوەيە كە جيهادو بڵاوكردنەوەى ئيسلامەتى‌و شەڕ لەپێناو بەرزكردنەوەى ئاڵاى ئيسلامدا كارى سەرەكييان بوو بەجارێ موسلمانانى بەخۆيەوە گلاَند، جا ئەمە چ لە ڕووى شيعر دانان بێ يا شيعر سەرايى بێت لە هەردوو لا موسلمانان سستيان نيشاندا.

دووەم: زۆرى ئەو كەسانەى كە شيعريان لە سەروبەندێكەوە بۆ سەروبەندێكى ديكەو لە چينێكەوە بۆ چينێكى ديكە رادەگواست‌و لە شەڕو جيهاد كردندا شەهيد بوون.[٣٨]

لەو قسانەى (ئيبن سەلام)دا وا دەردەكەوت كە ئيسلام لە دواخستن‌و لاوازى شيعردا تاوانێكى نەبووە، بەڵكو وەك گوتمان بارودۆخى سەردەم واى دەخواست كە موسڵمانان خوو بدەنە جيهاد كردن‌و گيانيان لەپێناو بەرزكردنەوەى ناوى خودادا بەخت بكەن، ئەوكاتە نەك هەر شيعر بەلاوەنرابوو.. بگرە ئيمانداران بۆ ويستى پەروەردگار ماڵ‌و موڵكيشيان بەلاوە نابوو و وڵاتانيان تەى دەكردو ئيسلامەتيان بڵاو دەكردەوە.

(ئیبن خەلدون) راوبۆچوونێکی نوێو قوڵترو باشتری لەم بوارەدا هەیە دەڵێ: (موسوڵمانان بە ڕەوانبێژی قورئان ئەوەندە سەرسام بوون هیچ شتێکی دیکەیان لەبەرچاو نەبوو.)[٣٩]

پاشان دەڵێ: (لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامدا موسڵمانان خەریکی کاروباری ئایینی و چاوەنۆڕکردنی رۆژ لەدوای رۆژی هاتنە خوارەوەی قورئان بوونو ئەمە وای لێ کردن، لە ئاستی شیعردانانیدا بێ دەنگ بن... بەڵام دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کە قورئان شیعری لا پاوان نییەو پێغەمبەریش(د.خ) زۆر بە پەرۆشی شاعیرە ئیماندارەکانەوە بوو، ئەوسا ئەوانیش لەناو دەریاکانی شیعردا وەسۆبایی کەوتن)[٤٠]،

لەپاشان(ئیبن خەلدون)دان بەوە دادەنێ کە لاوازی شیعر لە سۆنگەی هەڵوێستی ئیسلامەوە دەربارەی ئەم هونەرە نەکەوتۆتەوەو دەڵێ: (موسڵمانانی پێشوو هەرکە لە شیعر دوور کەوتنەوە... ئەوە لەبەر ئەوە نەبوو کە بانگەوازی نوێی ئیسلامەتی ئەم هونەرەی پەسەردبوو، بەڵکو مەنتیقی ئەو بارودۆخەی (تازە نەفەس)ەی دەبوو بەگوێی بکەن ناچاری کردن پێ دەگەڵ رەوتی زەمانەدا جووت بکەنو بەلایانەوە کارکردن لە قسەکردن گرنگتربوو)[٤١]

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم هەنگاوە گەیشتە سەر دووڕیانی دوو سەردەم: رووخانی کۆنو بنیاتنانی سەردەمێکی نوێ کە کارکردنی زیاتری.. لە گۆرانی بێژتندا دەویست بۆ ئەم گۆڕانکارییانە.

یەکێکی دیکە لە لێوەتوێژان کە (نجیب البهبینی)یەو خاوەنی کتێبی (مێژووی شیعری عەرەبی)یەو (لاوازی شیعری سەردەمی زووی ئیسلامەتی بە ئاین‌و گۆڕانکاریگەلێکەوە کە تێیدا روویان دا دەبەستێتەوە.

بەلام (یحیی الجبوری) ئەم رایەی (بهبینی) پوچەڵ دەکاتەوەو دەڵێ: (ئەمە لە راستی دوورە، بەڵگەشمان ئەوەیە کە شیعرەکانی- زوهێرو لبید- هەر بەو هێزو پێزو کەف‌و کوڵەی خۆیانەوە مانەوەو لاوازی شیعری لە سۆنگەی هۆکارێکی دیکەوە کە پەیوەندی بە هۆکاری ئاینییەوە نییە کەوتۆتەوە)[٤٢].

(یحیی الجبوری) بەجارێ بۆچوونەکانی ئەم لێوەتوێژانە وەلا دەدا کە دەڵێن هۆی لاوازی شیعر لەوەڕا هاتبووە گۆڕین، چونکە موسڵمانان سەرگەرمی ئاینی بوون‌و خۆیان لە شیعر نەبان کردبوو.. لەم بارەیەوە دەڵێ: (زۆرم سەیر بەم لێکۆڵینانەوە هاتەوە کە لەم مەسەلەیان وەکۆڵیوە.. کاتێ دەربارەی ژیانی ئەدەبی ئەو سەردەمە خەریکی لێوەتوێژینەوەکەم بووم، بۆم دەرکەوت، شیعر لەڕووی دانان‌و شیعر سەراییدا بەر هیچ گۆڕانکارییەکی ئیسلامەتی نەکەوتووە، بەڵکو شیعر لەرێگای خودادا چەکێکی بەهێزی جیهادخوازبووەو شاعیران لە پێشەوەی هەموو موسڵمانانەوە بوون‌و بە شیرو تیرو شیعرەکانیان بەرگریان لە ئاینە پیرۆزەکەیان دەکرد، لە هەمان کاتدا شەڕ لەنێوان بەرەی موسڵمانان‌و ناخودایان وای لە شیعر کرد کە بگاتە ئەوپەڕی بەهێزی.. بەتایبەتی لە بواری هونەری لاواندنەوە و پیاهەڵگوتندا گەیشتە چڵەپۆپە.)[٤٣]

هەندێ لە لێوەتوێژان بۆ ئەوە دەچوون کە ئەوهەموو شیعرانەی لە دژی پێغەمبەر(د.خ)و موسڵمانان هەڵبەسترابوون... هەرکە شاعیرەکە موسڵمان دەبوو شیعرەکانیشی لەگەڵ ئاینە کۆنەکەییدا لەناو دەچوون.. بەڵام (د.بنت الشاطئ) ئەم رایە بە هەڵە دادەنێتودەڵێ: (کتێبەکانی ژیانی پێغەمبەر(د.خ)و یارانی و کتێبە ئەدەبیەکان تاکو ئیمڕۆش چەندین شیعری ئەو شاعیرانەیان، کە پێش موسڵمان بوونیان لە دژی پێغەمبەریان دادەنا هەرماون، تاکو ئێستاش شیعرەکانی (ئومەییەی کوڕی سەلت) کە لە دژی موسڵمانان کانگای شیعری هەڵدەڕشت، لەگەڵ ئەوەی کە ئەم شیعرانەی ئەم شاعیرە بە دڵی پێغەمبەریش(د.خ) نەبوون هەرماون.)[٤٤]

ئەو لێوەتوێژینەوەی (د.شوقی ضیف) لەو بارەیەوە لە کتێبی (چەرخی ئیسلامی)دا ئەنجامی داوە، وادەگەیەنێ کە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە شیعری سەردەمی زووی ئیسلامی بەلاواز دادەنێن نییەو وا روون دەکاتەوە کە شیعر لەو سەردەمەدا تا بڵێی بەهێزو گەشە دارتر بووەو زۆری ئەو شاعیرانەی موسڵمان دەبوون، لە خۆشەویستی ئیسلام بە تەوژم بیری شیعریان بۆ دەهاتو ئەوەی سەیری کتێبەکانی وەك(الأغانی والطبری و سیرة بن هیشام و الاصابة والاستیعاب)بکات، بۆی دەردەکەوێ کە شیعر لەو سەردەمەدا لە سەرووی هەموو زەمانێکەوەبوو.)[٤٥]

بەڵام ئەم بۆچوونە لەکن هەندێ کەسان پەسەند نەبوو، هەر لە پای وەش (د.محمد فتوح) بەرپەرچی (شوقی ضیف) دەداتەوەو دەڵێ: (قسەکانی شەوقی دژی بۆچوونەکانی خۆیەتی، چونکە

بەستنەوەی گەشەکردنی شیعر بە شاعیرە هەڵکەوتووەکانـەوە.. ئـەوە دەگەیەنێ کە ئەو سەردەمە بە بارودۆخی مێژووییـنەی خۆی.. کەڵـە شاعیرێکی بەرزی تێدا نەبووە، بۆ بـوونی خـۆی و شـیعرەکەی ببێتـە بەڵگـە، هـەروەها لـە هـەمان کاتـدا پـێ لەسـەر ئـەوە دادەگـرێ کـە بانگەوازی نوێی ئیسلامانە شیعری پاوان نەکرد، شیعر لـەو نیگایـەوە کـە هونـەرێکی بـەرزەو هەسـتو خوسـتی کۆمـەڵێکی بـەدەنگ دێـنێ، چەندین هۆکاری دیکە بۆ لاوازکردنی شیعر هـەبوون لەوسـەردەمەدا، جگە لەو هۆیانەی وەکو کز بوونی ململانێی نێوان تیرەکانی عەرەبو سـەرقاڵ بـوونی موسـڵمانان بـە جیهـادو بنیاتنـانی دەوڵـەتی نـوێی ئیـسلامی کـە لـە پێـشەوە باسمـان کـرد.. هۆیـەکی گرنگـی دیکـەش ئەوەیـە کـە داهێنـان لـە جەرگـەی ئـەم گۆڕانکاریـە کۆمەڵایەتییـە گەورانەدا کـە لـە سـەرهەڵدانی ئیـسلام کەوتنـەوە، شـیرازەی سـەنگو پێوانەی بەجارێ گۆڕاو تێکچوو..

ئـەم گۆڕانکارییـە گەورانـە وایـان لـەو شـاعیرانە کـرد نـەختێ بڕەوێنـەوەو بـیر لـەوە بکەنـەوە دەربـارەی ئـەم گۆڕانکاریـە گەورانـە داخـۆ چ دەبـێ بڵـێن و چـی شایـستەیە بیڵـێن، ئیـدی ئـەم جـۆرە ڕووداوانەش دەبنە مایەی هاتنـە گـۆڕێی کـەشو هەوایـەکی نـوێ کـە پێویـستی بـە چـەند کاتێـك هەیـە بـۆ لـێ تێگەیـشتنو دەگەڵیانـدا گونجان، ئەم تێـزە تـا رادەیـەك لەگـەڵ ڕای (یحیـی الجبـوری) یـەکیان گرتۆتەوە کە دەڵێ: (لە ئیسلامدا شیعر پایەی کۆنی خۆی پاراستووە، نـەیتوانی بگاتـە ئـەو بزووتـە ئایینییـە گەورەیـەی کـە بـۆ گـۆڕینی کۆمەڵگایـەك هـەموو شـتێکی تێـدا گۆڕیـووە هـاتووەو تـەوژمێکی

بەهێزی لە دەروونی خەڵکیدا دروست کرد کە بوو بە هۆی بەرەو باشتر گۆڕینی بیرو هەڵسو کەوتو نەریتو رەوشتی مرۆڤ.

لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانکاریانەشدا ، کەچی شیعر درێژەی بیرەوەرییە کۆنەکانی سەردەمی نەزانی بوو، تەنانەت شیعرەکانی (حسانو، کەعبو، ئیبن رەواحە)ش لە سەرەتاوە هەر نەیانتوانی بگەنە ئاقاری وەی هەموو لایەنێکی زانیارییەکانی ئیسلام فێربنو دەگەڵ ئەم گۆڕانە گەورەیەدا پێ هەڵگرن.)[٤٦]

**تێزی لاوازی شیعر لە سەرەتای ئیسلامەتیدا لەسەر دووجۆر بیرکردنەوەی سەرەکی هەڵنراوە:**

**یەکەم: هەڵوێستی ئیسلام**

**دووەم: پەنگدانەوەی رێژەیی (الركود النسبي) :**

گەر ئەو زەمەنەی شیعری پێ ناسرابێتو لەگەڵ گەشە کردنی شیعری پێش ئیسلامدا بەراوورد بکەین بۆمان بەدیار دەکەوێ کە لە سەردەمی جاهیلیەتدا، بێ ئەوەی شاعیر بیر بکاتەوە داخوا ئەوەی دەیڵێ بۆ ناوەرۆکی شیعر دەگونجێ یان ناگونجێ... هەڵدەستا بێ پەردەو پەنا لە دەرگای هەموو ئارەزوویەکی مرۆی دەداو لەهیچ کۆی نەدەکردەوە..

هەرکە ئاینی ئیسلام بەخێرا بەجیهاندا بڵاو بۆوە، قسە ناشیرینو بێ پەردە نالەبارەکانی رەت کردەوەو رەفتارە دزێوەکانی بەدواوەدا، شیعریش بەندوبارێکی سنووورداری بۆ دانرا، بۆی هەبوو باسی هەموو شتێ بکات لە چوارچێوەی ئاکاردا.

جگەلـەوەش شـیعر بـۆوەی بـە شـیعرێکی نـوێ بـیرو ئیـسلامانە بژمێردرێ، دەبوا بەرگری لە بانگەوازی پەروەردگار بکات..

تێزێکی دیکەش کە بە کۆڵەگەو پاڵپشتی ئەو کارە دادەنرێ ئەوەیە کە شیعری جاهیلی بە بەراوورد لەگەڵ شیعری ئیسلامدا، هێنـدێ لـە سەردەمی جاهیلیەتدا بەهێزو پێزو زۆرو زەوەنـدەو لـە سـەروبەندی سەرەتای ئیسلامدا، کزوکەنەفتو بێ ڕەنگوڕوو دادەنێن.

لەراستیدا سەنگو تەرازووی بەراووردکاری بەم شێوەیە لەبارنییە، چـونکە شـیعر نـاکرێ بخرێتـە خانـەی بـەراووردکاری دوو قۆنـاغی مێژووییـنــەوە، هــەردوو قۆناغەکــە گــەلێك جیاوازیــان لــە ڕووی خۆرسـكو ڕەنــگو ڕووی تایبــەتو لــە شـیعر گەیـشتنەوە هەیــە، تەنانــەت نــاتوانرێ بــەراورد لــەنێوان سـەرلەبەری شـاعیرانی تاكـە قۆناغێکیشدا بەڕێكوپێکی بکرێت.

(د. زەكــی موبـــارەك) دەڵــێ: (نـــاتوانرێ بـــەراورد لـــەنێوان شـیعری(حـسان)و شـیعرەکانی شـاعیرە کـافروو جوەکانـدا لـە یـەك قۆناغـدا بکرێـت چـونکە لـە سـای دنـەو پاڵپـشتی پێغەمبـەر(د.خ)و موسڵماناندا(حسان) گەیشتە پلەیەکی بـەرزو بـوو بـە شـای شـاعیرانی سەردەمی خۆی.[٤٧]

(د. زەكــی موبــارەك) ســووکە بــەراوردێکی لــەنێوان شــاعیرانی ســەردەمی جـاهیلی و سـەرەتای ئیـسلامەتیدا دەکـاتو دەگاتــە ئــەم چەند راستیانە:

١-شیعری ئیسلامی لە نیگـای مانـای بـە هێزوپێزییـەوە لـە شـیعری جاهیلی پڕترە.

٢-بابەتەکانی شیعری ئیسلامی، لەبەر فراوانی لایەنی ئاینی، لە شیعری جاهیلی بەرفراوانتر بوون.

٣-بە سایەی ئاست بەرزی و بەهێزوپێزی زمان پاراوی قورئانەوە پلەی شیعری ئیسلامی لە پلەی شیعری جاهیلی نزمتر بوو.

٤-پلەی شیعری ئیسلامی لە ڕووی رەوشتو ئاکارەوە لە شیعری جاهیلی بەرزترو خاوێن تربوو.

٥-شیعری ئیسلامی لە بواری زۆری کەرەستەی دارشتنی شیعرەوە لە سەردەمی جاهیلی بەرزتربوو.

٦-شیعری ئیسلامی لەڕووی پتەوی بنەمای شیعرەوە لە شیعری جاهیلی بەهێزتربوو.[٤٨]

(د. عبدالقادر القط) یش بۆچوونێکی دیکەی دەربارەی ئەم تێزەیە هەیە.. بەلای ئەوەوە شیعری عەرەبی بە هاتنی ئیسلام، تەنها لە چەند ڕوویەکی کەمەوە نەبێ، کاریگەری ئەوتۆی بەرنەکەوتو لاوازی شیعریش پێش هاتنی ئیسلام، لە دوادوای سەرووبەندی جاهیلییەتدا دەستێ پێ کرد.[٤٩]

ئەوەش گومانی تێدا نییە کە شیعر ئادگاری هەردوو سەردەمو هەردوو قۆناغ وەردەگرێ.

دەربارەی ئەم کێشەیە هەندێ تێبینی گرنگمان دێتە بەرچاو:-

١-دەبێ دان بە بوونی ئەم هەڵوێستانە دابنێین کە ئیسلام لەکاتی سەرهەڵدانییەوە بەرامبەر شیعر نواندوویەتی، ئەم هەڵوێستانەش

که له پێشەوە باسمان کردن، وەك هەڵوێستی قورئانو پێغەمبەرو هاوڕێکانی بوون٠

٢-ئەو هەڵوێستە گشتییەی ئیسلام بەرامبەر شیعرو شاعیرانی هەبوو له هەموو بارێکەوە، هەڵوێستێکی دوژمنکاری و سەلبی نەبوو، راستتر وایە بڵێین، کە ئیسلام هەڵوێستێکی خۆرسكو رێكوپێکی لەگەڵ پێداویستییەکانی ململانێی دژ بە بێ باوەڕی هەبوو، لە هەموو شتێ گرنگتر لای موسڵمانان گەشە کردنو پەرەپێدانی رەوتی ئیسلامەتی بوو.. بە هەموو شێوەیەك بەرگریان لێ دەکردو دژی هەرکەسێك رادەوەستان ویستبای زیان بە پەیامی خودا بگەیەنێ.

٣-پارێزگاری ئەو هەڵوێستە گشتیانە بە هەرسێ شێوازەکەیەوە، چاكو خراپو مام ناوەندییەوە.. بەڵێ ئەو رەفتارەی ئیسلام لە بەرامبەر شیعرو شاعیراندا، بەدرێژایی ژیانی پێغەمبەر(د.خ)و جێنشینەکانی، هەروا بەردەوام بوو، بەڵام دوای ئەو ئاژاوەیەی کە خەلیفەی تێدا شەهیدکرا، ئەم هەڵوێستە بەتایبەت لە سەردەمی ئەمەوییەکانو، پاش گرفتو کێشەو هەرای سیاسی نێوانیان لەسەر جێنشینی پێغەمبەر(د.خ) بە بارێکی دیکە گۆڕاو شاعیرێکی زۆر پەیدابوونو شیعرەکانیان لە هەموو جۆرە بیروباوەرێکی ئیسلام بەدوور بوو.

٤-ئەم تێبینییە پەیوەندی بە باری جەنگی نێوان موسڵمانانو کافرانەوە هەیە، هەرچەندە ئەم شەڕە بە شەڕی ئایین ناوی دەرکردبوو و راستیشە لە ڕووی گەشەی کۆمەڵەکی و بیرو

شارستانیەتەوە رەنگ دانەوەی ئەو کێشەو هەرایەیە، بەڵام کێشەو هەرای شیعر سەرایش بەشێکی گرنگی ئەو شەڕە بوو.

ئاشکرایە ئیسلام هەموو جۆرە شیعرێکی سەردەمی نەفامی رەت نەکردۆتەوە و جاڕی شەڕی لەگەڵ تێکڕای شاعیرانی جاهیلی دا نەداوە،

ئیسلام بە چاوی رێزەوەی نۆریویەتیە ئەو شاعیرە جاهیلیانەی کە داوای رەوشتو رەفتاری بەرزی مرۆڤایەتیان دەکردو بەرگریان لە دادپەروەریو یەکسانی و ئازادی دەکرد.. بەنموونە پێغەمبەر(د.خ) تابلێی شیعرەکانی (ئومەییەی کوڕی ئەبو سەلتو نابیغەو ئەبو کەبیری هەزلی و تورفەی کوڕی عەبدە)ی بەدڵ بووەو، هەرچواریشیان بێ باوەڕ بوون.[٥٠]

گۆڕانکاریو بەرەوپێشچوونی شیعر، وای کرد، کە نەتوانین شیعری ئیسلامیو شیعری جاهیلی دەگەڵ یەکتر بەراوورد بکەین، لە هەمان کاتدا بیرکردنەوەی لاوازی شیعریش لە سەرەتای ئیسلامەتیدا رەت دەکاتەوە، گریمان شیعر لەو سەردەمەی ئیسلامدا تووشی لاوازی هاتبێ... تۆبڵێی هەر لەگەڵ باری ئاڵۆزی و تێکچوونی شیعری جاهیلییەوە تووشی ئەم کزی و لاوازییە نەبوبێ؟ ، لە سەرێکی دیکەشەوە ناتوانرێ شیعری جاهیلی پێش ئیسلام بە نموونەی بەرزی شیعری کۆنی عەرەب دابنرێ، چونکە دەشێ لە چەرخەکانی پێش ئیسلامەتی شیعری عەرەبی لەوپەڕی بەهێزی دا بووبێو رووداوەکانی مێژوو لاواز کردبێ؟! .. بەلای زۆر لێوەتوێژانەوە ئەم

شیعره جاهیلیانەی كە لەبەردەستدان ، تەنێ هەر شیعری یەكێ لە قۆناغەكانی بەرەوپێش چوونی شیعره.[51]

پێش وەی دوایی بەشیكردنەوەی ئەم(بیرۆكە)یە بهێنین.. دەڵێین ئەوكەسانەی ئەو جۆره بیرەباوەڕەیان هێنایە گۆڕێ.. بە ووردیان لە راستییەكانی شەڕو هەرای نێوان موسڵمانانو كافرانیان نەڕوانیوەو لە هەموو سەرێكەوە لەو مەسەلەیەیان نەكۆڵییوەتەوە، وایان كردبا بۆیان روون دەبۆوە كە شەڕی هەردوولا شەڕی مانو نەمان بوو.

بەلای موسڵمانانەوە شەڕی مانو سەلماندنی راستی ئیسلام بووەو لای كافرانیش شەڕی درێژە بە دەسەلاتدان و پارێزگاری ژیان بەردەوام بوونو سامان پاراستن بووە.

هەر لەبەر ئەم چەند هۆیەش بووە كە ململانێیەكە ململانییەكی دژوارو توندو تیژبووە.. لەم ململانێیەشدا شیعر شان بەشانی قورئانو فەرمایشتەكانی پێغەمبەر(د.خ) لە شەڕدابووە.

نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ كە لە پاڵ كەڵە شاعیره پیاوەكانیشدا، شاعیرانی-ئافرەت-یش لەم هەموو ململانێیەدا رۆڵێكی بەرچاویان گێڕاوەو دەستو خامەیان رەنگین بووە.

(مەیمونە كچی عەبدوڵڵاو هیندی كچی ئەساسە) كە بە شیعرەكانیان بەرگریان لە ئیسلام دەكردو بەرپەرچی ئافرەتە بێ باوەڕەكانیان: (هیندی كچی عوتبەو قەتیلەكچی حارس) یان دەدایەوە، ئەم دوو ئافرەتە شاعیره بۆ بەدرێژە بەشەڕدان بەتایبەت لە شەڕەكانی (ئوحدو خەندەق)دا، بە شیعرەكانیان هانی كافرەكانیان دەدا.

دوای بــه نموونــه هێنانــەوەی ئــەم هــەموو فەرمایــشتو ڕووداوه لەمێژینانــەی کــه هەڵوێــستی پێغەمبــەر(د.خ) بەرامبــەر شــیعرو شاعیران دەستنیشان دەکەین دەگەینە ئەم ئەنجامەی خوارەوە:

١-هەڵوێستی پێغەمبەر(د.خ) تێکڕا دەربارەی شیعرو شاعیران.. لەو چــەند ئایەتــە پیرۆزانــەی کــە لــە پێــشەوە باسمــان کــردن، لــە بیروبۆچوونی قورئانەوە وەرگیراوە.

٢-پێغەمبــەر(د.خ) بــەپێی بــارودۆخی شــەڕو ئاشــتی و لەســەر گەیاندنی پەیامی خـۆی سـوور بـوونو بـۆ هەمیـشە سـەرفراز بـوونی بانگەوازی خـودا، سـەیری شـیعری کـردووەو بـۆ پەرەپێـدانی ڕەوتـی ئیسلامەتی، شیعری بەلاوە ئامرازێکی کاریگەر بووە.

٣-ئــەم هەڵوێــستەی پێغەمبــەر(د.خ) تــەنیا بەرامبــەر شــیعری شــاعیرانی خــودا نــەناس نــەبووە، بگــرە بەرامبــەر شــیعری هــەر شاعیرێك، بەبێ ئـەوەی سـەیری ڕەگـەزو بـاوەڕی شـاعیرەکەی کردبـێ هــەر هــەمان هەڵوێــستی هــەبووە، بــۆ ئەمــەش نموونــەمان زۆرنو ئــەوەبوو لەپێــشەوە دەربــارەی شــیعرەکانی (لەبیــدو ئومەییــەو عەنتــەرە)و چــەندانی دیکــەمان لەمــەڕ هەڵوێــستی پێغەمبــەر(د.خ) نموونە هێنایەوە.

شـــیعر لای پێغەمبـــەر قـــسەیەکی هەڵبەســـتراوو هۆنراوەیـــە.. وەرگـرتنو ڕەت کردنـەوەی بـە سـەنگو تـەرازووی ئـەو مانایـەی کـە دەیبەخشێ دەپێورێ ، بەتایبەتی قەبوڵ کردنی شیعرێك کـە لەگـەڵ فەرمایــشتو بیروبــاوەڕی ئیــسلامدا هــاودەنگ بــێو بــەرگری لــە

شکۆمەندی پەیامی خودا بکات، ئەوە شیعرێکی ئیسلامانەیەو قوبوڵ دەکرێو جێگەی ڕێزلێنانە.

پێغەمبەر وا لە شیعر گەیشتووە کە دەبێ لەگەڵ بانگەوازی ئیسلامداو، ئەم بانگەوازەیەش هەموو لایەنەکانی وەك: ڕەوشتیو، ئایینیو، ڕامیاریو، کۆمەڵەکیو، ژیاری دەگرێتەوە هاومەبەست بێ.

هەر لەبەر ئەم ڕاستییانەش پێغەمبەر(د.خ) لەگەڵ هەندێ شاعیردا توندوتیژو لەگەڵ هەندێکی دیکەدا نەرمو نیان بووەو، دەستی ڕێزی تایبەتیشی لە هەندێ شاعیری دیکە ناوە ئەوەش هەمووی بەپێی بارودۆخێك کە کافرەکان بەسەر موسوڵمانانیان دەسەپاندو لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامەتیدا بەشێکی زۆری شاعیرانی قوڕەیش لە دژی موسڵمانان بوون بەکۆسپ، ئەدی نابینی فەردوودەکانی پێغەمبەر(د.خ)و، ئەوانی لە بەراییەوە باسمان کردن، بۆ ڕەواندنەوەی ئاسەواری ئەو کۆسپو تەگەرانە، چەند بەکار بوون.

بەڵام دوای ئەوەی زۆر لە شاعیرە بێ باوەڕەکان باوەڕیان هێنا، ئەوکاتە پێغەمبەر(د.خ) چەمکی شیعری وێران کردنو شیعری ئاواکردەوەی لێك هەڵاوێردوو لەسەرپێوانەی ئەوەی هەڵناو ڕانا کە تا چ ئەندازەیەك ئاکاری بەرزی ئیسلام دەپارێزێ و، لە ڕێڕەوی ئیسلام بستێ جوێ نابێتەوە، دامەزراند.

لێکۆڵەران لەسەر وەی کە داخۆ شیعر لە سەرەتای ئیسلامدا بەرەو کزی و لاوازی چوون، یا نا، دەڵێین: لاوازی شیعر لەو قۆناغەدا سەروکاری بە هەڵوێستی ئیسلامەوە لە شیعردا نییە، چونکە بانگەوازی نوێی شیعری پاوان نەکرد، وەکو هونەرێکی بەرز لەو

**هونەرانــەی دەبنەمایــەی دامەزرانــدنی چەشــەی کۆمەڵــەکی بــەڵکو هەروەکو لەپێـشەوە باسمـان کـرد، هـۆی ئـەو کزبوونـەو لاوازی شـیعر سەروکاری بە نـەمانی شەڕوشۆڕی نێـوان تیرەکـانی عـەرەب هـەبووە.. کە ئەوەش بە هـاتنی ئیـسلام بـەو شـەڕو شـۆڕانە قەڵـەمڕەوی شـیعر گـەرموگوڕبوو و هـەر تیرەیـەك بـۆ پیـا هـەڵگوتن‌و کـەم کردنـەوەی پایەی تیرەکەی بەرامبـەری و بەرپـەرچ دانـەوەی شـاعیرانی تیرەکـەی دی، شاعیرەکانی خۆی هان دەدا.**

**پاشــان بــە جــەنگ‌و جیهـادو بنیـات نـانی دەوڵـەتی ئیـسلامەوە ســەرقاڵ بــوونی موســڵمانان بــوو بــە مانــەوەی پەنگانــەوەو خەسـت بوونەوەو بەرەوپێشەوە هەنگاو هەڵداشتن...**

**لەهەمان کاتیشدا شیعر نەیتوانی لەگەڵ خێرایی ڕەوتی گۆڕانکاری فیکـری دا بـڕوات کـە ئیـسلام هێنایـە کایـەوەو شـیعر لەئاسـتی ئـەم ڕووداوە مێژووییە شۆڕشگێڕەدا نە بوو..........**

---

## **پەیوەندی ئاین بە ئەدەبەوە**

**پەیوەندی نێوان ئاین و ئەدەب پەیوەندییەکی ئاڵۆزو جێی قسەوباسێکی زۆرەو،بەدرێژایی مێژوو سەرنجی زۆر کەسانی بۆخۆی ڕاکێشاوە، بەردەوامیش هەندێ لە داهێنەرانی بەرزکردۆتەوەو هەندێکیشیانی وەلاوە ناوە، هەروەها پەیوەندییێکە ئاوێکی زۆری پێدا ڕۆیشتووە و بەبێ ئەوەی**

بگەنە قسەی کۆتایی یان قسەیەکی گشتگیر ، هەڵکشان و داکشان و پەنگدانەوەی زۆری بەخۆوە بینیووە..،.

دیارە کە دەقی ئاینی لە زۆربەی ژیارەکاندا بوەتە بناغەی ئەدەب ، جگە لەمەش خاڵی وەرچەرخانی زۆرێکیان بووە ، ئەمەش لە کەلتووری زۆربەی ولاّتە موسلمان نشینەکاندا دوای دەرکەوتنی دەقی قورئانی روویانداوە و وەرچەرخانێکی نوێی ئەدەبی درووستکردووە کە شێوازێکی پەخشان ئامێزی بۆ گوزارشتکردن داهێناوە ...کە ئەویش شێوازی شیعری تەواو دەکات .

هەچەندە دواتر ئەو ئەدەبەی بە ئەدەبی جوان ناسرا ،لە سەرچاوە ئاینیەکەی کە ئەویش بە ئەدەبی پیرۆز ناوزەدکرا دوورکەوتەوە...، لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی هێماو توخمەکانی ناو دەقە پیرۆزەکانی لە پرۆژە نوێخوازیەکەی تەوزیف کرد ،کە تەوەرەی سەرەکی ناواخنەکانی تایبەت بوو بە ئازارو مەینەت و ئارەزووەکانی مرۆڤ ، هەروەکو ئەوەی لە سەردەمی رێنساس لە ناو ئەدەبی ئەوروپیدا روویدا ، کە بۆ دامەزراندنی ژیارێکی نوێ کە سەرچاوەی سەرەکی تەوەرەکەی مەینەتییەکانی مرۆڤ بوون سوودی زۆری لە کتێبە پیرۆزەکان وەگرتووە ، هەروەکو گۆتە بەناوبانگەکەی _ ولیام بلایك_کەدەڵێ (سەردەمی کۆن و سەردەمی نوێ تەواوی سیستەمی رەمزی ئەدەب درووست دەکەن ) دواتر رەخنەگری ناسراو (نورپروب فرای ) لە میانەی چەندین کتێبدا رەهەندەکانی ئەو گۆتەیەی (فرای) راڤەکرد و تیایدا باسی ئەو رۆڵە سەرەکییەی کرد کە (کتێبی پیرۆز)بۆ ئافراندنی ئەدەبی نوێ گێڕاویەتی و ئەوەشی دەرخستووە....گەر بێت و ئەو دەلالەت و رەمزە ئایینیانەی لێ دامالّین ئەوە ماناکانی خۆیان لەدەست دەدەن و

دەپوکێنەوە ، هەر ئەوەش لەسەر ئافراندنی ئەدەبی عەرەبی و پەیوەندیەکەی بە (پیرۆز)ەوە پراکتیزە دەکرێت .

## تەئویل و تەغریبی ئاگا

پەیوەندی نێوان ئاین و ئەدەب لە ناو (تەئویل)ەوە بە مانا فراوانەکەی خۆی حەشارداوە ، ئەدەب لە دەقە پیرۆزەکان سوود وەردەگرێت و لە گۆشەی ئاینی رەهاوە نزیکی ناکەوێت بۆ ئەوەی خۆی تووشی کون و کەلە بەرەکانی (فیقە و لاهوت)نەکات ، بۆیە بە تەئویلکردنی هەڵدەسێت ئەمەش بۆ ئەوەی لە ئاستی میتافیزیکییەوە بۆ ئاستی مرۆیی بیگوێزێتەوە و لە پرۆژەیەکی مرۆیی سیاسی یان کۆمەلایەتی تەوزیفی بکات ، هەردەقێکیش بە هەموو رووەکانییەوە لە گۆشەی (تەئویل)ەوە نەبێت نزیکی ناکەوێت ، ئەمەش دانپیانانێکە بە دەسەلاتی هێما ئاینیەکان لە سەر گوزارشتکردن لە ناخی داهێنەر و بزواندنی ئەندێشەی خوێنەر زیاتر لە هەر هێمایەکی دیکە ، ئەوەش ئەم راستییە دەردەخات کە بونیادی هزری مرۆیی پەیوەندییەکی بەهێزی بە هێما ئاینییەکانەوە هەیە و ئەو (پیرۆز)ەی کە زایەندی یەکەمی ئەدەبی پێکهێنا ، بەردەوام وەکو پێدەرێك لە پێدەرە سەرەکییەکانی ئەدەب دەبێت.

هەندێ جاریش ئەم دۆستایەتییەی نێوان ئەدەب و دەقی پیرۆز روو لە دوژمنداری دەکات ، بەتایبەتی لەو کاتانەی کە شارستانییەت روو لە خراپی دەکات ، ئەوەش (جادامز) ناوی لێناوە (تەغریبی هۆشیاری جوانی)بە هەمان رادەی رەنگدانەوەی (تەغریبی هۆشیاری ئاینی)، ئەمەش وا دەکات کە ناکۆکی نێوان ئاین و داهێنانی ئەدەبی زیاتر پەرەبسێنێ و دواتر

هەردوکیان لە ناوەرۆکە رۆحییکەی بەتاڵ بکاتەوە ...ئەمەش بەبێ هیچ پاساوێکی لەبار.

بەم پێیە دەتوانین موغامەرەی شاعیرە نوێیەکانی سەردەمی زووی عەباسیەکان وەربگرین کە بە توندی دوژمنداری بە پیروزکردنی شیعری کۆنیان دەکرد و لە قەسیدەی شیعری سەردەمی جاهیلی هەڵگەڕانەوە.

هەر ئەمەش لەگەڵ رۆماننووسانی نوێی عەرەب روویدا ئەوکاتەی بەتەوزیفکردنی دەقە پیرۆزەکان هەڵسان و بە راشکاوی ئاماژەیان بەم دەقە پیرۆزانە لە رۆمانەکانیان کرد ، بە تایبەتی ئەوکاتەی دەقێکی ئەدەبیان داهێنا کە خۆیان لە قەرەی دەقە پیرۆزەکان دەدا ، هەڵلایەکی گەورەی پەرپاکرد و بە بێ دین و گومڕا ناوزەدیان دەکردن ، کە چۆن ئەم کاری شەیتان ئامێزەیان ئەنجام داوەو بە مەبەستی پیسکردنی پیرۆزیەکان لە هێلی سوورەکانیان داوە .

یەکێ لەو جۆرە کارە ئەدەبیانە رۆمانەکانی(کورانی گەڕکەکەمان)ی نەجیب مەحفووز و (گەرانەوەی گەنجی.....)ی عەبدولحەکیم قاسم و (داوەتی گیای دەریایی)ی حەیدەر حەیدەر و(نانی پەتی)محمەد شوکری و چەندانی دیکە بوون.

هیچ رۆمانێکی عەرەبی تاکو ئیمڕۆ ئەوەندەی رۆمانی (کوڕانی گەڕەکەکەمان)ی نەجیب مەحفووز کە لە ساڵی ١٩٥٧دایهێناوە مشت و مڕی لە سەر نەکراوە ، بە جۆرێ کە هەموو ئاماژەکردنێکی بۆ پیرۆزیەکان و دەلالەتە رەمزیەکان لە سەر بنەمای دەقە ئاینیەکانەوە هێناوە ، ئەمەش وای کرد کە دوای بە زنجیرە بلاّوبوونەوەی لە رۆژنامەی (ئەلئەهرام)دا نەیان هێشت جارێکی دیکە بلاّوببێتەوە و جگە لەمەش کەش و هەوایەکی

نالەباری بۆ رۆمانەکەو نەجیب مەحفووز درووستکرد، ئەم کەش و هەوایەش بەردەوام لەگەڵ هەر بۆنەیەکدا دووبارە دەبۆوە وەك وەدەست هێنانیی خەلاٌتی نۆبل لە ساڵی ١٩٨٨و بەرامبەرکردنی لەگەڵ رۆمانی (ئایەتە شەیتانییەکان)ی نووسەری (ئینگلیزی_هیندی_ سەلمان روشدی )و لەم رۆژانەش کە خەریکە رۆمانەکە بە پێشەکییەکی یەکێ لە گەورە نووسەرانی لایەنە ئیسلامیەکانی میسری لە چاپ دەدرێتەوە ، ناوەندی رۆشنبیری بەمەهەوالأنە خەریك کردووە .

دەتوانین بڵێین کە (کوڕانی گەڕکەکەمان) کەوتۆتە داوی کێشە سیاسیە گرژەکان و هێرشکەرو بەرگریکەرەکانی کەوتوونەتە جەنگێکی ناپێویست و بێ سوود ، رەنگە ژیرانەترو بابەتیانەتر بووایە گەر راستگۆیانە سەیری سرووشتی ئەم دەقە ئەدەبیە کراوە بەسەر دەقە پیرۆزەکاندا بکرایە بەبێ مل کەچکردن بۆی.

## بونیادی رۆمانەکە :

بۆ دەرخستنی ئەو بۆچوونەی پێشەوە پێویستیمان بە وەستانێك سەبارەت بە لایەنەکانی هونەری لە بونیادی رۆمانی (کوڕانی گەڕەکەکەمان)دا هەیە ، ئەو رۆمانەی کە بە دەلالەت و هزرو ئیستاتیکایەکی زۆرەوە دەوڵەمەندە ، ئەو دەوڵەمەندیەش پەیوەندی بە لاگیری بەردەوامی (مەحفووز)ەوە بۆ نوێکردنەوەی جوانییەکان هەیە ، ئەمەش لەگەڵ قەناعەتی سیاسی و فەلسەفیانەی نەگۆڕی خۆیدا ،چونکە ئەو لەوکاتەی کە رۆمانی (کوڕانی گەڕکەکەمان)ی نووسی دەیتوانی سوودلە سەرکەوتنەکەی رۆمانی((سێکوچکە_الثلاثیة_(السکریه،بین القصرین،قصر

الشوق))وەربگرێت و بە بەردەوامی بەو ئاراستە ریالیزمییە سەرکەوتووەی دا وەکو زۆر لە رۆماننووسانی دیکە گوزەر بکات .

خوێنەرانی رۆمانەکە دەزانن کە نزیك بوونەوەو تەوزیفکردنی چیرۆکەکانی پێغەمبەران بێ رەمزو دەلالەت نین بەڵکو بواری تەئویل و شیکردنەوەی چیفرەکانی دەقی رۆمانەکە دەکەنەوەو بە گێڕانەوەی شێوازی (مەحفووز) یانە شتە پیرۆزەکانی چیرۆکە ئایینییەکان لە خۆی دادەماڵێ : یان رەهەندێکی ئایینی و شێوازێکی ئاینی دەبەر چیرۆکەکان دەکات، جگە لەمەش (مەحفووز) مومارەسەکردنی (گەمەی هونەری) لە خۆی دوور نەکردۆتەوە ...

چەندین جار وتراوە کە دەتوانین (کوڕانی گەڕەکەکەمان) وەکو گوزارشتکردنێکی وەرگرتە لە مێژووی میسری و عەرەبی یان مێژووی مرۆڤایەتی بە هێماکردنێکی دیاردا وەربگرین ، بەلاّم باشتر وایە کە بە روئیایەکی مێژووی مرۆڤایەتی دایبنێین کە مۆرکی رەگەزی میسری و عەرەبی دیاری پێوەبێت و کە گرنگترینیان روئیای بازنەییە بۆ مێژوو ، هەروەکو پێشتر (ئیبن خەلدون) لە خوولەکانی ژیانی نەتەوەکاندا لە میانەی زنجیرە (رێنساس)ە کاندا باسی کردووە کە لە سەر دەستی چاکسازە بوێرەکاندا سەری هەڵداوەو ئەو (مەنگ)یەش کە لە سەر دەستی نەوەکانی دوای ئەوان هاتۆتەکایەوە.

بەڕای من لایەنەکانی بلیمەتی (نەجیب مەحفووز) لە تەوزیفکردنی ئەم روئیایە لە هەردوو رۆمانی (حەرافیش) و (لیالی الف لیلە) زیاتر بەرجەستەو پڕ جوانی و بە دەلالەت ترە و بەبێ

**ئەوەی هەرایەکەی رۆمانی (کوڕانی گەڕەکەکەمان) بنێتەوە ،ئەمەش دوای ئەوەی (مەحفووز) فێری وانەکە بوو و خزایە ناو رەمزییەت و تەمومژی و هونەرەکانی گوزارشت کردنی هونەری.**

**رێگەی تەواوی راستکردنەوەی دەسەڵاتیش هەروەکو سەدەکانی کۆن و ناوەڕاست لە ئاین و رەوشت خۆی دەبێنێتەوە ، بۆ روو بەروو بوونەوەی دەسەڵاتێکی چەوت دەبێ ئەو دژەدەسەڵاتە هەبێت کە پێشتر هەموو تیۆرەکانی سەروەری نەتەوەیی و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لە یەکتری لێ پەیدا بوون ، وەکو نووسینەکانی (لۆك و مۆنتسیکۆ) لە سەردەمی زێرینی ئەوروپا ، بۆیە (مەحفووز) بۆ چاکسازی گەندەڵی دەسەڵات خۆی بەلای چارەسەری رەوشتی داداوە، ئەمەش لە میانەی پیادەکردنی دادپەروەری لە سەر دەستی پیاوێکی باش و دواتر نەمانی ئەم دادپەروەرییەش بە نەمانی ئەم پیاوە چاکە،وەکو (جەبەل و رفاعە و قاسم)، هەروەها (عەرەفە)ش کە لە هەوڵە چاکسازییەکەی لە رێگەی زانست و مەعریفدا فەشەلی هێنا.**

## ئاوێزان بوونی جوانی و پیرۆزی

**رۆمانی (کوڕانی گەڕەکەکەمان)لە سەرەتاو کۆتایی دا گوتارێکی سەردی ئەندێشەییە ، لە هەردوو گوتاری ئاینی و مێژوویی خۆی کە دەیانگێرێتەوە ، بۆیە لێرەدا قەت ناکرێ لە بابەتی (پیرۆز)دا بە رۆمانێکی ئاینی ناوزەد بکرێت، بە تایبەتی لەگەڵ کرانەوەی فەزایەکانی تەئویل و فرە خوێندنەوەکان لە رۆمانێکی پاك بە پلەی یەکەم بۆ سرووشتی خۆی ،دواتر بە هیچ جۆرێك گوزارشت لە درووستی یان نادرووستی هاوشێوەو نا هاوشێوەی بیروڕا کە فەزای گشتی رێپێدەریەتی ناکات، بەڵکو فەزایەکی**

دیکە دەکاتەوە ئەویش فەزای خەیاڵە ، بە جۆرێك کە سنووری نێوان ئەدەب و شەهیدبوون و نیوان واقیع و خەیاڵ و نێوان حیکایەت و گێڕانەوەی دەچێتە سەر شێوەی بزێوی جیووە ئاسا و بە ئاسانی جیا ناکرێتەوە.

لێرەدا گونجاوە گەر ڕێسایەك بێنینەوە کە دەڵێ : چۆن ئەدەب دەتوانێ خۆی بە وەرگرتن لە ئاین تەواو بکات بە بێ ئەوەی تیایدا نغرۆ ببێت و هەڵوێستەکەی وەرگرێت ، لە هەمان کاتدا هزری ئاینی پەرەی بەخۆی نەداوە تەنها لە ڕێگەی لە خۆگرتنی ووزەی ئەدەبی ئافرێنەر نەبێت و تەوزیف کردنی لە کردەی ئەو (بەیان= رەوانبێژی) یەی کە لە سەر کارامەیی بێژەیی ناوەستێ بەڵکو لە سەر توانای گوزارشتکردنی لە راستی و لێژبوونەوەی بۆ ناو دەروونی مرۆیی دەوەستێ و تێری دەکات ، هاوکات لە گەڵ سرووشتە تایبەتەکەی ، بەم بارگە زیادەی لە ئەقڵ (مەرجیش نییە کە دژی بێت چونکە ئاین و ئەقل لە یەك ئاست دانین )، دوای ئەم چەند دێرە ویستم ئەوە بگەیەنم کە هیچ پێویستییەك بە هیچ دوژمنارییەك لە نێوان _جوانی (ئەدەب) و پیرۆزی (ئایین)_ ناکات و چەندە هزری ئاینی و داهێنانی ئەدەبی لە یەکتر جیا ببنەوە ئەوەندەش هەردووکیان روو لە قەتیس بوون و پاشەکشێ و وشك بوون دەکەن [٥٢] ٠

## ئەدەبی ئیسلامی و سەرەتای سەرهەڵدانی

درێژەدانو گرێدانی نێوان زانستو ئـەدەبو هونـەر سـیفەتێکە لـە سـیفەتەکانی هـزر لـە ئیـسلامدا، جوانکـاریش بـۆ ئـەدەب پێویـستە، بـەڵکو لـە ڕەنگدانـەوە بیرەکییـەکانی دیکـەی وەك زانـستو هونـەردا نیشانەی جیاکردنەوەیە، جا لێرەدا ئەوپـەڕی جوانکاری ئەوەیـە کـە هـەروەکو چـۆن زانـست دەتگەیەنێتـە کـەناری خـوا لـێ ڕازی بـوون، ئەدەبیش بتگەیەنێتە کەناری ئەو دڵنیاییەی کە دان بە جێ پەنجەی توانـایی پـەروەردگار لـە گەردوونـدا بـنێو، وەسـفی ئـەم ئاسـەوارە بکـەیت.. بـەمجۆرە ئـەدەب لـە سـرووشو پـەیام جیـا ناکرێتـەوەو جیابوونەوەیان تاریکستانی هزرو ژیان دەگەیەنێ..

**ئەدەبی ئیسلامی بە دیدی ئـەدەب، ڕووانینـی ویـژدانی ئیـسلامەو، بە دیدی ئیسلام ڕوانینی ویژدانی ئەدەبە.**

هـەر لـە پەیـدابوونی ئیـسلامەوە هـەتاکو ئـەمڕۆ شارسـتانیەتی ئیسلامی نەیتوانیووە گوزارشت لە ڕۆحی تەواوی خۆی لە بوارەکـانی ژیاندا بکات، بەوجۆرەی کە ئیسلام بڕوایەکە سیـستەمێکی گشتگیری ژیـانی لـێ پەیـدا دەبـێ، ئـەدەبی ئیـسلامی دەبـێ کـار لەسـەر ئـەو ڕاسـتییەی سـەرەوە بکـاتو بیکاتـە هـەوێنی هـەموو هەڵکـشانو ئافراندنێك.

زۆر لە لێوەتوێژان.. ئەدەبی سەرەتای سەرهەڵدانی ئیـسلامەتی بـە بەردی بناغەی ئەدەبی ئیسلامی دادەنێن.. پاشـان ئـەدەبی ئەمـەویو عەبباسی کە دەسەڵاتدارێتی ئەو قۆناغەیان کـە پێیـدا تـێ دەپـەڕین، دەردەبڕی، هاتنە گۆڕێ..

له ساڵی(١٩٦٢ز) چیرۆك نووسی لێهاتوو (نـهجیب گـهیلانی) کتێبـی **(الاسلامیة والمذاهب** الادبیة ـ ئیسلامگەرایی و رێبازە ئەدەبییەکان)ی بڵاوکـــردەوە، چـــەمكو تیـــۆری ئـــەدەبی ئیـــسلامی لەســـەر ئـــەو بەرهەمانـەی کۆنو نـوێی ئیـسلامەتی کـە سـەریان هەڵدابوو خـستە ڕوو.

پاشـان چـەندا لێکۆڵینـەوەی دیکـە دەربـارەی ئـەدەبی ئیـسلامی، وەکو(ئەدەبی ئیسلامی)و (ڕەخنـەی ئـەدەبی ئیـسلامی) هاتنـە گۆڕێ هــەروەها گــرنگترین ئــەو کتێبانــەی لــەو بــوارەدا ســەریان هەڵــدا، (ڕەخنەی ئیسلامی و هاوچەرخی-١٩٧٩)و هەوڵە نوێیـەکانی ڕەخنـەی ئیسلامی (دکتۆر عیمادەددین خەلیل) بوون.

دواتر بۆ خستنە رووی چەمکی ئـەدەبی ئیـسلامی.. بەتایبـەتی لـە یەکـەم کـۆنگرەی ئـەدەبی ئیـسلامی دا کـە لـە شـاری (لکهنـوا) لـە هیندوستان گێڕدرا، بە پێشنیارو سەرپەرشتی ڕێزدار (ئەبی حەسەن ئەلنـەدەوی) لـە (١٣/ی جمـاد الاخـرە/١٤٠١ ك) بەرامبـەر (١٩٨١/٤/١٧) چەندان سیمینارو کۆڕیان گێڕاو مشتومڕێکی زۆریان لەسەر کرد.

دوای ئـــەم کۆنگرەیـــە لەســـەر ئـــەدەبی ئیـــسلامی و ڕەخنەکـــەی چـەندان لێکۆڵینـەوە بڵاوبوونـەوە.. هـەروا چـەند زانکۆیـەك هـەوڵی خوێندنی ئەدەبی ئیسلامییان لە کۆلیژە ئەدەبیەکانیدا دا.[٥٣]

له ساڵی ١٩٥٢ز دا بـۆ یەکـەمجار مامۆسـتای شـەهید (سـەید قوتـب) زاراوەی ئـەدەبی ئیـسلامی بـەکارهێنا.. هیـوای ئـەوەبوو بـە هەسـتو خوستی ئیسلامی دڵو دەروونی خەڵك پڕبکاتەوە.

دواتر ڕێزدار (محەممەد قوتب) پێی لەسەر ئەم زاراوەیە داگرتو لە پێناسەکردنیدا دەڵێ: ئەدەبی ئیسلامی٠٠ گەردوونو ژیانو مرۆڤی لە نیگای ئیسلامەوە بۆ ئەو بۆچوونە زۆر جوان دەربڕیوە.[٥٤]

(د. نەجیب گەیلانی) لە جیاوازی زاراوەی ئەدەبی ئیسلامی کە گوزارشتی لە ئەدەبی ئیسلامی دەکرد. ئیسلامگەرایی(الاسلامیە)ی بەکار هێنا بەلای ئەوەوە ئیسلامگەرایی دەبێ بەرامبەر (کلاسیکیەتو ڕۆمانسیەتو واقیعیەتو ڕێبازی ڕەمزی و چەندان ڕێبازی ئەدەبی ئەوروپی دیکە بەکاربهێنرێ).

بەڵام ئەم زاراوەیە لەلایەن زۆر لە ئیسلامخوازانەوە پەسەند نەکرا، پاشان بۆخۆشی وازی لەم زاراوەیە هێنا و لە کتێبەکەی (مدخل الى الادب الاسلامی – دەروازەیەك بۆ چوونە ناو ئەدەبی ئیسلامیی)دا زاراوەی ئیسلامگەرایی (الاسلامیە)ی بە زاراوەی (ئەدەبی ئیسلامی)ی گۆڕییەوە، پاشان (د. ئەحمەد بسام السباعی) کتێبی (الواقعیة الاسلامیة في الادب والنقد – ریالیستی ئیسلامی لە ئەدەب و ڕەخنەدا)ی بڵاوکردەوەو وەدەرخستو تایبەتمەندبیەکانی واقعیەتی ئیسلامی ڕوون کردەوە، بەڵام لەلای زۆر کەسان ئەدەبی ئیسلامی هەر ئەدەبی ئیسلامییەو وەك چۆن ئیسلام هەر ئیسلامەو تایبەتمەندێتی خۆی هەیەو.. ئیدی پێویست بەو جۆرە وەسفانە ناکات.

بەلای ئەوانەوە (واقعیەتی ئیسلامیی) زاراوەیەکی نالەباربوو و، بەمجۆرە زاراوەی ئەدەبی ئیسلامی جێگەی خۆی گرت.

له ساڵی ( ١٩٨٢ز/١٤٠٢ك) دا له ماوەی نێوان (٥-٨ ی رەجەب)دا له کۆلیژی زمانی عەرەبی له (الجامعة الاسلامية – زانکۆی ئیسلامی)ی مەدینەی منەوەرەدا دووەم کۆنگرەی ئەدەبی ئیسلامی بەسترا.. ژمارەیەکی زۆر له ئەدیبو رۆشنبیرو رەخنەگران بەشداریان تێداکرد، لەبەردەم کۆنگرەکەوە چەندین گوتارو لێوەتوێژان خوێندرانەوە... هەرلەوێ لەبەردەم حەشاماتێکی زۆری ئەدەب دۆستان (د.نەجیب گەیلانی) گوتی:

(ئەدەبی ئیسلامی پێویستییەکی مێژوویینەی گرنگەو نابێ بە قسەی ئەوکەسانە بکەین کە دژی ئەم تێنۆڕینە دەوەستن، چونکە دەکارێکدا ئەدەبی سۆشیالستی و وجوودی و بێهوودە (عەبەس)ی و رەمزی و نمایی هەبن.. ئەوە شتێکی داهێنراو (بیدعە)نییە کە ئێمەش ئەدەبی ئیسلامیمان هەبێ.[55]

**لەو کۆنگرەیە داواکرا کە:**

١-له هەموو دەزگاو وەزارەت و زانکۆکاندا گرنگی بە ئەدەبی ئیسلامی بدرێ و له قۆناغەکانی خوێندنی دواناوەندی و زانکۆکاندا بخوێندرێ.

٢-بابەتی ئەدەبی ئیسلامی بەگشتی و ئەدەبی بانگەواز بەتایبەتی له بەشەکانی دەعوەو راگەیاندن دا له خوێندنی باڵا بخوێندرێ.

٣-توێژەران له زانا موسڵمانەکان بەگشتیو ئەدیبو رەخنەگران بەتایبەتی داوابکەن باسو لێکۆڵینەوە سەبارەت بەم ئەدەبە ئامادە بکەن.

٤-بۆ دامەزراندنی کتێبخانەی تایبەت بە شوێنەواری ئیسلامی کونو نویٚ داوا لە گشت زانکۆی وڵاتانی ئیسلامی کرا.

٥-وەرگێڕانی کەلەپووره ئەدەبییە ئیسلامییەکان لە زمانی عەرەبییەوە بۆ هەموو زمانانو٠٠٠ لەو زمانانەشەوه بۆ سەر زمانی عەرەبی.

٦-لە زانکۆو دەزگا زانستیەکانو یانە ئەدەبیەکان داواکرا کە پشتگیری ئەدیبە لاوەکان بکەنو پێشبڕکێی بەسوودی چیرۆكو شیعرو شانۆی ئیسلامی لەنێوانیاندا ئەنجام بدەنو بەرهەمە چاکەکانیش لەچاپ بدەن.

٧-بەرنامەیەکی تەواو بۆ ئەدەبی ئیسلامی دابنرێ.

٨-گۆڤارێکی تایبەت بە ئەدەبی ئیسلامی بەگشتی و هەروەها ئەدەبی منداڵانو لاوان بەتایبەتی دامەزرێ.

٩-پەیمانگەو ئەو کۆلیژانەی رێبازه ئەدەبیەکانیان تێدا دەخوێندرێن دەبێ ئەوه روون بکەنەوه کە رێبازه ئەدەبییە نائیسلامییەکان گۆتاوەڕۆی فەلسەفە بیانیەکاننو لەگەڵ بەهاو زانیاری ئیسلامیدا ناکۆكو لێك دووفاقن.

١٠-بابەتو دەقە ئەدەبیەکان کە لە پەیمانگەو کۆلیژەکاندا دەخوێندرێن دەبێ لە هەموو شتێك کە دژی رێڕەوی ئیسلامی بێ خاڵی بن.

١١-دەبێ زانکۆیەکان گرنگییەکی زۆر بە ئەدەبی ئیسلامی بۆ منداڵان بدەنو لە قۆناغەکانی خوێندنی ئامادەیی و خوێندنی باڵادا بخوێندرێنو پلەی ماژستێرو دکتۆرای لەسەر وەربگیرێ.

١٢-دەبێ هەموو بابەتە ئەدەبیەکانو سروودەکان لە قۆناغەکانی خوێندندا بریتی بن لە دەقی هەڵبژاردەی ئەو شیعرو ئەدەبە لێهاتووانەی بە جوانترین شێوە نسکۆو کارەساتی شوێنە پیرۆزە داگیرکراوەکانوگەلانی موسڵمانی ستەمدیدەی تۆمارکردووە، بەتایبەتی ئەو دەقانەی وێنەی پاڵەوانێتی موسڵمانان دەکێشێ وەکو سەرکردەی بێ وێنەی کورد(صەلاحەدینی ئەیوبی).

١٣-پێویستە ئەو ئەدەبە ئیسلامییە کە بۆ قۆناغەکانی خوێندن دیاری دەکرێن سەروکاریان بە قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێت)و ئاسەواری یارانییەوە هەبێ.

١٤-بانگهێشتی زانکۆکان بۆ دامەزراندنی بنکەکانی ئەدەبی ئیسلامی بۆ کۆ کردنەوەی سەرچاوەکانی ئەو ئەدەبە.

١٥-لە کاربەدەستانی زانکۆی ئیسلامی لە مەدینەی منەوەرە داوا بکرێ لقێکی خوێندنی بالا بۆ ئەدەبی ئیسلامی و بنەما رەخنەییەکانی... بۆ پێگەیاندنی پسپۆڕانی تایبەت بەو ئەدەبە دامەزرێ.

١٦-چەند کورسیەکی خوێندن بۆ ئەو ئەدیبە موسڵمانانەی کە زمانی عەرەبی نازانن لە پەیمانگەو زانکۆی وڵاتە ئیسلامیەکاندا، بۆ شارەزابوون لەو زمانو ئاڵوگۆڕکردنی مەعریفە ئەدەبیەکان دیاری بکرێن.

١٧-پێویستە لەسەر کارمەندانی ئەدەبی ئیسلامی بۆ بەرەسەن کردنی زانستی ئەستاتیکاو سوودلێ وەرگرتنی لە بوارە ئەدەبیەکانداو بۆگونجاندنی شێوە لەگەڵ ناوەرۆك دا هەوڵ بدەن.

١٨-پاشان ئەندامانی کۆنگرەکە سوپاسێکی زۆری ئەو زانکۆیانەیان کرد کە پەیمانگەو کۆلیژی فێربوونی(زمانی قورئانو ئەدەبی ئیسلامی)یان دامەزراندووە، هەروەها ئاواتیان خواست کە زیاتر گرنگی بەو کارانە بدەن.(٥٦)

هەروەها لە ماوەی نێوان(٢٦-٢٨ ی مارس/١٩٨٢) (کۆڕێکی نێودەوڵەتی بۆ هونەر لە وڵاتە ئیسلامییەکان) لە شاری(فارنهام کاستل-بەریتانیا) بۆ برەودان بە هونەر بەسترا.(٥٧)

## رواڵەتی ئەدەبی ئیسلامی

---

**بۆ دارشتنی ئەدەبی ئیسلامی، دوو بەرنامەمان هەیە:**

یەکەمیان: وەسفیە پشت بە وەسفی ئەو ئەزموونە ئەدەبیانە دەبەستێ کە لە (١٥سەدە)ی رابردووی مێژووی ئیسلامی دا نووسراوە.

دووەمیان: پێوانەکییە کە بەپێی کۆمەڵی پێوەری لەسەر تێنۆڕینی فەلسەفیانەو ئیستاتیکیانە تێنۆڕین دروست دەکا، بۆ هەر هەوڵدانێك کە چارەسەری دەقی ئەدەبی دەکات، ئەو پێوانەکییە، هێڵەگشتییەکانی تێڕوانینت دەداتێ، کە خۆت چارەسەری دەقەکان بکەیت.

ئەو بەرهەمە ئەدەبیانەی کە لەمێژووی ئیسلامەتی دا هاتوونە بەرهەم بۆ رێکخستنی ئەو ئەدەبە بەس نییە، ئێمە بۆ تاووتوێ

کردنی ئەدەبیاتی ئیمڕۆ و داهاتوو بۆئەوەی بخرێتە خانەی ئەدەبی ئیسلامییەوە پێویستمان بە چەندان هەوڵو تەکانی تر هەیە.[٥٨]

لە رووی فراوانی ئەدەبی ئیسلامییەوە، ئەوە.. ئەو بەرهەمە ئەدەبیانەش دەگرێتەوە کە هیچ دژایەتیەکیان لەگەڵ ڕێڕەوی ئیسلامدا نییە.. بۆیە زۆر لە رەخنەگرە ئیسلامییەکان شانۆنامەو چیرۆكو شیعری ئەدیبە ناموسڵمانەکانیش دەخەنە ئەوخانەیەوە، وەکو (تاگۆر)و (ئەلیخاندروکاسونا).[٥٩]

ئەدەبی ئیسلامی هەموو جۆرە ئەدەبێك کە لەگیانی ئیسلامەتی نێزیك بێ، ئەگەر خاوەنەکەی موسڵمان بێت یان نا، لا پەسندە.

ئیسلام وەکو بیروباوەڕێکی کامل هەموو شتێکی سەرەکی و گرنگی بەهۆی ئەو هێڵە پانو پۆڕانەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر خستە روو، لەوکاتەدا هەندێ ووردە ریشە (تفصیلات)ی بۆ شەرع زانو زانست خوازوو ئابووری زان و کۆمەڵناسو هونەرمەندان بەجێ هێشت کە ئەوەش وەکو بۆشاییەك جێهێڵراوە کە بە قەڵەمڕەوی خۆ تێدا ئەزموونکردنی مرۆ نێو دەنێینو بۆ سروشتی ئەو قۆناغەی کە بیرو هۆشی مرۆڤایەتی دەیگاتی بەجێ دێڵیین..

هەر لە سەرەتای چەرخی ئیسلامییەوە، هەوڵێکی بێ وێنە دراوە بۆ پڕکردنەوەی ئەو (بۆشاییە جێ هێڵراوە)، ئەو قەڵەمڕەوە لە هەموو گۆڕەپانەکانی زانستی ئیسلامی دا، دراوە لەم چەرخەش لە هەموو چەرخەکانی دیکە پێویستمان بە تەواوکردنی ئەو لێوەکۆڵینو قەڵەمڕەو و ئەزموونکردنەو بۆشایی پڕکردنەوە هەیە.

ئەدەبیش یەکێکە لەو مەعریفانەی کە بۆ موسڵمانان ماوەتەوە و لەسەریانە خۆیان تەواوی بکەن، بەتایبەتی لەوکاتەی کە ئیسلامخوازانو دەزگا ئیسلامییەکان لەگەڵ شارستانیەتی رۆژئاوا ( لەڕووی سەربازی و رامیاری و ئابووریو وەزیفەی ئەدەبیان لەیاد بوو) بۆ ماوەیەکی زۆر خەریکی ململانێ بوون، هۆی سەرەکی دواکەوتنی سەرهەڵدانی ئەدەبی ئیسلامیش وەك تیۆرێکی مەعریفی سەروکاری بەوەوە هەیە کە کەسانێکی بانگەشەیان بۆ ئیسلامەتی دەکرد، خۆیان لە ئەدەبیات نەبان دەکرد، بۆخۆشیان هەر لە بنەڕەتدا خاوەنی وشیارییەکی ئەوتۆ نەبوون، ئەدەبیاتیان لەکن گرنگ بێو بیکەن بە ماکی ورژاندنی دڵودەروونی خەڵك، بگرە دەزگایەکی وەکو ئەزهەریش هێندە نرخو بەهای لە ئەدەبو هونەر نەدەنا، ئیدی ئەوەبوو (شێخ محەممەد عەبدە) ئەدەبیاتی ئیسلامی کرد بە دەرسێك لە پلانی دووەمدا و هێنایە نێو بەرنامەی ئەو دەزگایەوە، سەربariش تەوژمێکی رەخنەگرتنو ئەدەبیاتی چاكو خراپ لە سەنگی مەحەك دانو رووی گەشوگەوهەری شیعری ئیسلام وەدەرخستنیش نەهاتەگۆڕێو ئەم بێ رەخنەو رەخنەکارییەش رەوتی پێشکەوتنی ئەدەبی ئیسلامی سست کرد.[٦٠]

وەزیفەی ئەدەبی ئیسلامی ئەوەیەکە ئەو خۆشەویستییە دەربخات کە لەنێوان مرۆڤ و پەروەردگاردا هەیەو، پاشان دەرخستنی ئەو خۆشەویستییە لەنێوان سەرجەمی مرۆڤایەتی و، بۆئەوەی لەم خۆشەویستییەدا جوانی ژیانو رێککەوتنی نێوانیان دەربکەوێ، ئەدەبی ئیسلامی ئەدەبی تیۆرە فەلسەفیەکانو ئامۆژگارییە

ئاكارەكییەكان نییەو ئەدەبی سۆزە هەڵچووەكانو هونەری ئەبستراكت (تجرید)یش نییە، بەڵكو ئەدەبێكە گرنگییەكی بێ وێنە بە راستییەكانو رەوشتو هەستو خوستو ئەستاتیكا هونەرییەكان دەدات.

ئەدەبی ئیسلامی ئەدەبێكە رەنگ بە راستییە گەردوونی و مرۆیی و هونەرییەكان دەداتەوە، ئەوانەش هەموویان لە چوراچێوەی رێبازێكی فیكریو هونەری یەكگرتوودا.

لەوكاتەی ئەدەبی نائیسلامی نەیتوانی سنوورێك بۆ ململانێی فیكری.. دەربارەی پەیرەوە گشتییەكانی ژیان دابنێ لەناو خەڵكیدا، ئەوكاتە ئیسلام بزوتنەوەی ئەدەبی و ئاینی هاوسەنگ راگرت. (٦١)

رۆژئاواش لە ئەنجامی ئەو هەرەس هێنانەی..، بەردەوامە لە گۆڕانكارییە فیكرییەكانیو چەمكە ئەدەبییەكانی.. ئەو گۆڕانكارییانەش ناو دەنێین دیاردەیەك لە دیاردەكانی پەرەسەندنو پێشكەوتنو شارستانیەت.

قسەكردن لەسەر ئەدەبی ئیسلامی سەروكاری بەگیانو ماددەوە هەیە، واتە: لە ماكی گەردوونو جەوهەری ژیان دەدوێ.

لێرەدا پێویست بە گووتنی شتێك هەیە.. ئەویش ئەوەیە كە ئەدەبی ئیسلامی و رێبەرانی دژی نوێخوازیونوێگەرایی نین، بەڵام نوێ گەرایی بەپێی بیروباوەڕی ئیسلام ئەوەیە كە لە شتی رەسەن هەڵقوڵابێ یان لە ئەدەبێك بدوێ كە ناوكرۆكی راستەقینەی ژیان دەربڕێ.. زۆر لەو كەسانەی دان بە بوونی ئەدەبی ئیسلامیدا نانێن،

ئــەوە لــەوە راهــاتووە کــە بــە گۆتــاوەڕۆی بــەکار تێکردنــی ڕێبــازە ئەدەبیــەکانی رۆژئــاوا کــەوتوون، ئەوکەســانە لــەوە دەترســن نــەبادا ئەدەبی ئیسلامی دژایەتییەکی لەگـەڵ ئـەو ڕێبازانـەدا هـەبێ.. جا وا بەباش دەزانن بۆ ئەوەی ئەو ڕێبازە ئەدەبیانە بەردەوام کاری خۆیان لـەناو جەرگـەی ئـەدەبی کوردیـدا هـەبێ، ئـەدەبی ئیـسلامیش وەلاوە بنــێن، چــونکە لــەلای زۆر لــە لێوەتوێــژانی ئیــسلامی، ڕێبــازە ئەدەبیەکانی نوێی رۆژئاوا هەر لـە کلاسـیکی و رۆمانـسیو واقیعـی و پەرناسی و رەمزی و وجودی و سوریالی و دادائـیو...هتـد، هـەموویان لە ئەندێشەو سوود پەرستی ماددی تەسك دان، یـەکێ لـەو ڕێبازانـە نەیانتوانیووە لەگەڵ سروشتی هاتنە گوڕێی مرۆدا بگـونجێن، ئەوانـە لەو دیدو بۆچوونە مرۆییانە ڕا کەکەوتوونەتە ژێـر کاریگـەری بـاری مەتریالیزمی کۆمەڵگەی ئەوروپای نوێ، پەیدابوون..

ئەو ڕێبازانە هەر چارەگە سەدەیەك لـەپڕ جارێ لەبـەر نـەزۆکیو بـێ بزکـوڕی و مایـە پووچـی ئەنجامـەکانی ئـەو ڕێبازانـە بگـرە هـەر لەدوای وجـودیو سـوریالی و دادائـی و بونیاتگـەراییو (لێکترازانیـی و ئـاوێزانیی – التفکیکیــە و التنــاص).. هــەر هــەموویان کەوتوونەتــە تـەنکاوو نـەیانتوانیووە پـەی بـە قـوڵایی هـاو پێوەنـدی نێـوان مـرۆو خوداوەندی گەورە بەرن.

مرۆ لە هیچ قۆناغێکی مێژویی مرۆڤایەتیدا.. رۆژێك لەرۆژان بـێ پەیقینو بنەماو بیرکردنەوە لەمەڕ گەردوونو ژیان هەڵی نەکردووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئـایین شـتێکی خۆڕسـکەو لـە مـرۆ جـوێ نابێتەوە، لە کردەوەو هەڵپەکانی مرۆدا و لە رەفتارو باری رۆشنبیری

وی بەدیار دەکەوێ، هەر بۆیەش رۆشنبیریتی گەلان دەگەڵ یەکدیدا و هەریەکە بە تەرزێك‌و هەریەکە بە جۆرێکە، زۆر لە زانایان لەسەر ئەو ڕایەن کە ئەدەب‌و هونەر لە سەرەتاییەکانی پەیوەندی بوونیاندا لە تێڕوانینی ئاینیانەو یەقینیەکانی دیکەڕا سەریان هەڵداوەو لە باوەشی یەقینی دا گەورەبوون..

ئەدەبیش هەر کاهینەکەبووەو هونەرمەندیش ئەو کەسە بووە کە بە پەڕەمووچان هەست‌و خوست‌و پابەندی خۆی لە بەرامبەر کردیگارێکدا نوواندووە..

لە قۆناغەکانی دوای مێژووی مرۆڤایەتی.. ئەدەب لەژێر سێبەری ئاین‌و کەش‌و هەوای ویدا بووە، ئەگەر سەیری ئەدەبی یۆنانی و رۆمانی و ئەوروپی لە چاخەکانی ناوەڕاستدا بکەین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، کە ئەدەبی رۆژئاواش تا چاخی بەردین.. هەموویان لەژێر کاریگەری ئاییندا نەش‌ونمایان کردووە، تا سەدەکانی (١٧ز، ١٩ز)ە تا قۆناغەکانی درەنگی شارستانییەتی ئەوروپی هیچ لێك پچڕان‌و لێك دابڕانێك لەنێوان ئایین‌و ئەدەبدا نەبووە، ئەگەر سەیری رێبازە ئەدەبیەکان بکەین دەبینین هەر لە کلاسیکییەوە تا دواترین رێبازی ئەدەبی‌و هونەری لە سەدەی بیستەمدا هەموو هەر لە یەقینیات‌و چەمکی ژیانی تایبەت سەریان هەڵداوە.. بگرە تا رێبازی هونەر بۆ هونەریش کە دەیەوێ ئەدەب لە ژیان و بیرکردنەوە دووربخاتەوە، تێڕوانین‌و بەرنامەو یەقینیاتێکی تایبەت دەردەبڕێ، ئیمرۆ لە جیاتی ئایین لە هاوپێوەندی ئەدەبیات‌و ئایدیولۆجیەت دەکرێ.

ت.س. ئـەلیوت T.S. Eliot کە لـە شـیعری نـوێی ئەوروپاییـدا نیشانەیەکی بەرچاوە..لە یـەکێ لـە وتارەکـانی دا بـە نـاوی (ئـەدەبو ئـایین) ـەوە کـە بـە بەرهەمـەکانی هێـزی رۆحـی شـیعرەکانی تۆمـار کـردووەو دەڵـێ: ئـەو هێـزە لـە زۆر ڕواڵەتـدا بەتایبـەتی لـە هێمـا ئاینیەکانـدا بـەدیار دەکـەوێ.. هـەروەها لـە رەخنەگرتنەکانیـدا کـە لەسەر گرنگی کەلەپوور لە کاری ئەدەبیدا سوورە.[٦٢]

جیهـانی ئـایین و جیهـانی ئـەدەب هـەوڵ دەدەن جـوانی بـە ژیـان ببەخشنو دەیانەوێ مرۆ لە هەردوو دنیا سەرفرازو دڵخۆش بکەن.

## پابەندی لە ئەدەبی ئیسلامیدا :

لـە سـاڵی (١٩١٤ز)دا لـە وڵاتەیـەکگرتووەکانی ئـەمریکا (قوتابخانـەی پابەندییـەتی کۆمەڵـەکی) لـە ئـەدەبو رەخنـەدا سـەری هەڵـدا، ئەوکاتـەی مرۆڤـی ئـەم وڵاتـە لـەو پـەڕی هەراسـانی رۆح شکستیدا، دەژیان لەبـەر کارەسـاتە دڵتەزێنـەکانی جـەنگی یەکـەمی جیهـانی تـا ساڵانی دوای رێکەوتی (١٩٢٠ز)کە تەنگـژەی ئـابووری جیهـانی هـەموو وڵاتی گرتەوە لەوکاتەدا ئەدیبو رۆشنبیران هەستیان بـە ئازارەکـانی گەلەکـەیان کـرد، پارێزگـاری وڵاتو بـەرگری لێکردنیـان بـە ئـەرکی سەرشـانیان زانـی، ئـەم (قوتابخانەیـە) وای لـە ئـەدیبان گەیانـد کـە ئەدیبو هونەرمەند تەرازووی پلەو پایەی کۆمەڵنو هەموو ئەدیبو هونەرمەنـدێکیش خـاوەنی پـەیامێکی کۆمەڵایـەتینو پێویـستە بانگەشەی بۆ بکات.[٦٣]

**لە مێژووی ئەدەبی عارەباندا نمونەی زۆری شاعیری پەیامدار هەن کە بەخێڵو ناوچەو نەتەوەو ئایینەکەیانەوە پابەندن، (عوروە کوڕی ئەلوەرد) کە لەپێش ئیسلامدا بە شاعیری لاتەکانی وڵات ناسرابوو لەوان بابەتانەیە، هەروەها لەسەردەمی ئیسلامەتی دا چەندین شاعیری پەیامداری هەبووینە وەکو (حەسان کوڕی سابیت)و، (عەبدوڵڵا کوڕی رەواحە)و، (کەعبی کوڕ مالیك)و چەندانی دیکە پلەو پایەی خۆیان وەرگرتووە، جگە لە شاعیرانی (الشراة- الخوارج) کەبە بڕوای تایبەتی خۆیانەوە پابەند بوون، (عیمران کوڕی حەبتان) لەسەر دەفتەریانەوە دێت، پاشان لەسەردەمی عەباسیەکاندا (ئیبن قوتەیبەی کوردی و دینەوەری) بە گەورەترین ئەدیبی پابەند (مولتەزیم) دادەنرێ.[٦٤]**

**لە مێژووی ئەدەبی کوردیماندا ئەدیبو شاعیرانی پەیامدار بۆ پاراستنی گیانی ئایینو نەتەوەو نیشتمان، ( خانی و حەمدی و مەحوی و نالی و حاجی قادری کۆیی و مەلا محەممەدی کۆیی و پیرەمێردو فایق بێ کەسو.... ) کە لە ئەستێرە بەرزو پڕشنگدارەکانی ئاسمانی ئەدەبی کوردین بە زمانو پێنووسیان بۆ گەلو نیشتمانو ئایینەکەیان درێغیان نەکردووەو، جێی تایبەتی خۆیان هەیە، زۆربەی شاعیرە کوردە دێرینەکانمان کە پەروەردەی مزگەوتەکانن دیوانەکانیان بێ شیعری ئایینی نەبووە، بەڵام وەکو سەرەتایەکی پابەندایەتی، زۆر لە شیعرەکانیان دەچنە خانەی ئەدەبی ئیسلامییەوە، جگە لە شیعرە پڕ لە پەندەکانی(خانی و**

مەحوی) کە لێرەدا جێگەی باس کردنیان نابێتەوە، (خودا یاربێ لە دەرفەتێکی دیکەدا بەدرێژیان لێ دەکۆڵینەوە).

لە ئەدەبی جیهانیش دا چەندین ئەدیبی لێهاتوو، بە گیان‌و خامەی لە زەبریان بەرگریان لە یەقینیات‌و دەورووبەریان کردووە..

(جۆن ملیتۆن- Gohn Mileton/ ١٦٧٤ ز) پیتۆل‌و ئەدیبی ئینگلیزو فیردەوسیی گومناو، بەشداری لەو شۆڕشەی (کرمۆیل)ی دا کرد، دژی پادشا شارلی یەکەم (١٦٤٩ ز) بۆ گێڕانەوەی ئازادی و بەختەوەری بۆ گەلەکەی، لەو تەرزە شاعیرانەیە، دواتر (برتولد برێخت-١٩٦٥ز) شاعیرو نووسەرو شانۆنووسی گەورەی ئەڵمانی، تا توانی بەرەنگاری ستەمی نازییەکان بووەوە، لەسەر ئەوە بەندکراو هەموو بەرهەموو کتێبەکانیشیان سووتاند.[٦٥]

ئەوەتا شاعیری رۆمانسی ئینگلیزی(لۆرد بایرۆن) وڵاتی خۆی جێ دەهێڵێو بەرەو یۆنان بۆ جەنگ دژی عوسمانیەکان بەڕێ دەکەوێ، هەر لەوێ لەسەر بەرگری کردن لە ئایینی خۆی گیان لەدەست دەدا.

ئەوکاتەی لە(ئەلبێرکامۆ) نووسەری گەورەی فەرەنسا دەربارەی جەنگی ئازادیخوازی گەلی جەزائیر لێیان پرسی، بە گرژییەوە وەڵامێکی بەر تەسکی دایەوەو گوتی:

(گەر لێیان پرسیم بۆخۆت سەرپشك بە کامیانت دەوێ: دادپەروەری، یان دایکت؟ دەڵێم.. دایکم.)

پابەندی لەلایەن رۆمانسیەکانەوە لە سەدەی نۆزدەهەمدا نەخشەی بۆکێشرا، ئەوکاتەی کە(کولوردج) ئەدەبی بە رەخنەگرتن لە ژیان لەقەڵەمدا، پاشان وەکو باسمان کرد ئەدەب لە ئەمریکا چەند

لایــەنی دیکــەی بــەخۆوە گــرتو هــەر لــە ســەرهەڵدانی ریــالیزم، بەتاییــەت لــە ریــالیزمی سۆســیالیزمی، کــە لایــەنی کۆمەڵایــەتی و رامیاری و چینایەتی دەردەبڕێ.

ئەدەبی پەیامدار بە کۆمەڵگاکەی بەستراوەو بە رۆحو دڵو بیر لە گەڵ دەورووبەری خۆیدایە بەرامبەر زۆر شتی گەورە، ئەدیبی ئیمڕۆ جیایـە لەگـەڵ هـی دوێـنێ، هـی ئـەمڕۆ دەبـێ هـەموو شـتێ بزانێـو بناسـێو، بەوانـە خـۆ چـەکداربکاتو ئاسـۆی بـیرو رۆشـنبیری خـۆی بەرفراوان بکات، لـە هـەموو ئـەو گۆڕانکارییـە رامیـاری و ئـابووری و کۆمەڵـەکی و فیکریانـەدا کـە لـەم جیهانـەدا روو دەدەنو کـە زۆر بـە خێراییەوە پەرە دەسێنێو دەگۆڕێن ئاگابێت.

کاری ئەدیبی ئیمڕۆ ئەوە نییە، مرۆڤ بە ئامۆژگاریو قسەی پەنـد ئــامێزو ئامۆژگــاری واق وڕکــا، نووســەری میــسری گــەورە (تۆفیــق ئەلحەکیم) دەڵێ: (فەرمانی نووسەر تەنها ئـەوە نییـە خوێنـەر قایـل بکات، بەڵکو دەبێ وای لـێ بکـات بـیر بکاتـەوە.. ئـەوەمان لـە نووسـەر نــاوێ خوێنــەر بخــافڵێنێو پــشووی پــێ بــدات، بــەڵکوو دەمانــەوێ ئەوکاتـەی خوێنـەر کتێبەکـەی پێـوە دەدا ئەوکاتـە ئـیشو ژانـەکانی دەست پێ بکەن.. کاری نووسەر ئەوەنییە ئاوەزوو هۆشیان بـێ هـۆش بکــات، بــەڵکو دەبــێ مێــشکیان وە بــزووت ئێخــێ.. نووســەر کلیلــی زەینە،خــەڵکی بــۆ دۆزینــەوەی راســتییەکانومەعریفەکان هــان دەدات.)(٦٦)

لەو ڕۆژەوە جیهانی ئیمڕۆ لە دەردە کۆمەڵەکیەکانو نەخۆشییە دەروونییەکانو نالەباری باری ئابووریو بڵاوبوونەوەی مایەی ئالودەگی و بیرو هۆش سڕکەر، پڕبووە.

ڕۆشنبیرو نووسەرانی ڕۆژئاوا ڕۆژانە هاوارو دادو فیغانیانەو لەناو کۆمەلگای خۆیاندا هەست بەو ئێشو ئازارانە دەکەن... ئێمەی ئەدیبی موسڵمان دەبێ زیاتر لەو ئیشو ئازارانە بترسێینو خۆمانی لێ بپارێزینو دەورووبەرمانی لێ وشیار بکەینەوە.

پابەندایەتی ئەدیبی موسڵمان هەروا گاڵتە نییە، کارێکی هەستەمو تاڵە، ئەدیبی موسڵمان زۆرجاران بە خامەکەی دەست پێ دەکاتو ئاکامی بە سێدارە دوایی دێت.[٦٧]

لەگەڵ ئەوەشدا کاروانی ئەدەبی ئیسلامیی هەر بەڕێوەیە، موسڵمانی پابەند (مولتەزیم) بە ئایینەکەیەوە، بە ئەدەبەکەیەوە پابەندە،هونەر بێ پابەندی، وەکو نوێژی بێ نییەت، کە هەردووکیان نادروستن وایە،[٦٨]

پابەندی لە ئەدەبی ئیسلامیدا دژی ئازادی نییە، چونکە ئازادی تەواو ئەوەیە کە جگە لە خودا هیچ شتێکی دیکە نەپەرستی.

## شکل( فۆرم )و ناوەڕۆك لە ئەدەبی ئیسلامیدا :

هاوسەروکاری واژە(الکلمە)و مانا نەخراوەتە ڕوو بەوجۆرە، وەك هەریەکە جیهانێکی تایبەتیان هەبێ، هەروەکو(ئیبن قوتەیبە) لە دابەش کردنی جۆرەکانی لەفزو مانادا دەڵێ: دەشێو دەشبێ لەفزومانا

بــاش بــن‌و یــەكێكیان بــاش‌و ئەویدیكــەیان خــراپ بــێ و هــەروا بەپێچەوانەشەوە.

هەروەها (عەبدولقادر الجەرجانی) تیـۆری یـەكگرتنی لـەفزومانای دارشت‌و بە تەنها پشتی مانای نەگرت.

لــە رەخنــەی ئەوروپیــدا ئــەم مەســەلەیە چــەند زاراوەیــەكی لــێ بووەوە، فۆرم‌و ئاخاوتن و فـۆرم‌و نـاوەرۆك‌و هـەر رێبـازێكی ئـەدەبی بەجۆرێك تێی دەڕوانێ، هەر لە (كلاسیكی)یەوە تاكو (تەفكیكیەت).

لە چاخی راپـەڕینی كلاسـیكیەتدا بـەرەو لایـەنی فـۆرم دەڕۆیـشت، لەوكاتــەی رۆمانــسیەكان‌و ریالزمیــەكان گرنگیــان بــە نــاوەرۆك دەدا، فەلــسەفەی (كانــت)یــش گرنگــی تــەواوی بــە فــۆرم دەداو ئــەدەب‌و هونــەری لــە هــەمو مەبەســتێك دامــاڵی، تــا هەنــدێ لایــەنگیرانی ئــەو رێبــازەی دەیــانگوت مەبەســت... هونــەر... تێــك دەدات‌و رەونــەقی دەبات جا لەسەر ئەمە تیۆری هونەر بۆ هونەر پەیدا بـوو، كـە لەگـەڵ بۆچوونەكانی (كانـت‌و هیگـڵ‌و گۆتـە) هـەنگاوی دەنـا، دواتـر چـەند (قوتابخانەی رەخنە)ی تر وەك قوتابخانەی وێنەئاراییی و قوتابخانـەی رەخنەگەرایی نوێ لە ئەمریكا پەیدا بوون.

پاشان لە سـەردەمی ریالیزمـدا ئەوپـەڕی گرنگـی بـە نـاوەرۆك درا، ئــەویش بەتایبــەتی لــە قوتابخانــەی مرۆگــەراییانی نــوێ-ذوالنزعــة الانسانیة الجدیدة- لە ئەمریكا كە شاعیرو رەخنەگری ئینگلیـزی‌و بـە ڕەسەن ئەمریكی (ت-س ئەلیوت) رێبەرایەتی دەكرد.

دەربارەی پەیوەندی لەنێوان فۆرم‌و نـاوەرۆك هـیچ رێبـازێكی كـۆن یان نوێ نادۆزینەوە لە ئەوروپا كە تەنها مەبەستی فۆرم یا نـاوەرۆك

بێت.. تا دەگاتە ڕێبازی هونەر بۆ هونـەریش کـە بانگەشـەی یـەکێتی کاری هونەری دەکات و پێ لەسەر بێ توانایی جیاکردنەوەی فۆرم لـە نـاوەرۆك دەکـات رادەگـرێ، چـەرخی ئیمـڕۆش بانگەشـە بـۆ کـەوتن و نەمانی پرنسیپی ئایدۆلۆژیاو دۆگمایی دەکات، کـە بووەتـە وێـستگەی ئەدەبو رەخنـە لـە ئەورووپا،کەئەمـەش دواتـر بـووە بـەردی بناغـەی سەرهەڵدانی بونیادگەرایی.

ئـەو بۆچـوونانەش کـە لەگـەڵ تێڕوانینـی ئـەدەبی ئیـسلامی ڕێککـەوتن بـۆ ئـەدەبو هونـەر، هـەر ئـەوەش بـوو کـە (عەبـدولقادر ئەلجەرجانی) پێی گەیشت دوای ووردبوونەوەیەکی زۆر لە پێکهاتـەی ئیعجازی قورئان کە سەرچـاوەی ئـەدەبی ئیـسلامییە، شـتێکی لـەبارو گونجاو نییە کە هزری ئیسلامی لەگەڵ شێوەیەکی باش دانەبێو ئـەو شـێوەیەش هـیچ مەبەسـتێکی مرۆڤایـەتی نـەبێ.. ئەمـەش دەچـێتە خانەی گاڵتەوگەپ.

پەیوەندییـەکی بـەتین لـەنێوان سروشـتی (بابـەت)و (قاڵـب) دا هەیـە.. (قاڵـب) فـۆرم کـار لـە بابـەت دەکـات چـونکە ئەگـەر هـاتوو بابەتەکـە فـۆرمێکی دژ بـەخۆی هـەبێ ئـەوە بـاری سروشـتی تێـك دەچێو ئیفلیج دەبێ.(٦٩)

وەك (موعتەزیلە) کاتێ ویـستیان بابەتـە شـەرعیەکانی ئیـسلامیی لـە قـاڵبێکی فەلـسەفی یۆنـانی دا دابڕێـژن... دواتـر بوونـە هـۆی کارەساتی دڵتەزێن لە مێژووی ئیسلامیدا.

هـەر شارسـتانیەتێك بناغەیـەکی فیکـری و چـەمك و قەوارەیـەکی رۆشنبیری خۆی هەیەو هەموو چاڵاکیە مرۆییەکانیش ملکەچی ئـەو

شارستانیەتە دەبن کە لێی پەیدا دەبن، ئەوەش لەسەر شارستانیەتی ئەوروپی دەچەسپێ کە دیموکراسیەت بنەمایەکی ئەو شارستانیەتەیەو لەلایەکی تر مەتریالیزمی مێژوویی بنەمای فیکرییەتی...لەبەر ئەوە ئەو یاساو بونیادە ئەوڕوپیانە فرەجیاوازن‌و هەر یەکەیان چەندین بیرو بۆچوونی جیاواز لێکدی هەڵدەگرن.. بۆیە دەبێ لەوپەڕی هۆشیاری دابین‌و بەباشی لە فیکرە ئەورووپییەکان ووردبینەوە، لێرەدا لەسەر موسڵمانی رۆشنبیرو سیاسی و ئابووری زان‌و ئەدیب پێویستە لە خاڵە جیاوازەکانی چالاکییە هەمەڕەنگەکانی ژیاندا بکۆڵێتەوە.

**ئەدەبی ئیسلامیی هەموو بیرو بۆچوونێکی رۆژئاوا رەت ناکاتەوە بەڵکو چاوێك بە ڕادەو بڕی پەیوەندی لەنێوان ئەو شێوەو بنەما فیکرییانە دەخشێنێتەوە.**

گەر ئەدەبەکەی ئەوان رەنگدانەوەی ئەو بنەما فیکرییەی ئەوان بێ ئەوا بێ گومان رەتی دەکاتەوە، بەڵام گەر هەر فیکرەو رێبازێکیان رەنگدانەوەی فیکرە بێ باوەڕەکەیان نەبێ‌و بێ لایەن بێ ئەوا گومانی تێدانییە وەری دەگرێ. هەندێ لەو بیرو بۆچوونانە هیچ دژایەتیەکیان لەگەڵ بنەمای فیکری شارستانییەتی ئیسلامی دانییە، بەڵکو لەگەڵیدا تەبان‌و بە شێوەو ڕەفتاری ئەو شارستانیەتەی نەکردووە.

هەروەکو(د. عیمادەدین خەلیل) دەڵێ:

**-(ئیسلام ئەو وێنەو شێوانە رەت دەكاتەوە كە بە ناوەرۆكەكەی ــ كە بنەمای بێ باوەڕییە ــ و نەتوانرێ لە یەكتریان جیا كەینەوە هاوپێوەستو هاوسەروكارە).**

**شتێكی لارو چەوت نییە ئەگەر بێین سوود لە كۆكیو توندو تۆڵی و وردەكاریی هونەری كلاسیكی وەربگرینو لە هەمان كاتیشدا سوود لە زمانی رۆمانسیەكان كەلە خۆرسك هەڵێنجراوەو هەروەها سوود لەو ئەندێشەو وێنە ئاراییە وەربگرین، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ كە ئەدەبی ئیسلامی بە بنەمای فیكری و رەوشتی كلاسیكی كە دەسەڵاتی (شا)یەتی ئەرستۆكراتی دەنوێنێ رازی بووە.**

**مانای ئەوەنییە كە ئێمە لایەنی رۆمانسیەكانمان قبوڵ بێ، ئەوە دەبێ لەسەر هەموو رێبازەكانی تریش پێوانە بكرێو دەبێ ئیسلامیش لەبەر رۆشنایی ئەو بۆچوونە دەڕوا بە ڕادەی چەند دووركەوتنەوەی لەو شێوە بنەما فیكرییە نا ئیسلامییانە لەلایەن موسڵمانانەوە وەربگیرێ..**

**خۆ ئەگەر تێڕوانینی ئیسلامیی ناكۆك نەبوو ئەوە بریتییە لە بەرهەمی ئادەمیزادێك كە لە مرۆڤایەتیدا وەكو یەكین، لە هەر شوێنێك بێت، ئەوسا ئەگەر برای ئیمانیمان نەبێ، ئەوە هاوبەشی تێڕوانینو شارستانیەتەكەمانە.**

**لە ئەوروپا هەموو تیۆرە فەلسەفیەكان لە یەك رێگەدا یەك دەگرنەوە ئەویش باوەڕ هێنانە بە بلیمەتی مرۆ، تیۆرە ماركسییەكان دەڵێن: دەبێ شێوەی ئەدەبی رەنگدانەوەی فیكری بێ.. هەروەكو (ارنست فیشر) دەڵێ: (ناواخنی نوێ دەتەقێتەوەو شێوەی**

نویّ دروست دەکات)؛ بەلای ئەدەبی ئیسلامیش مەرجو گرنگ نییە کە لەگەلّ گۆڕانی فیکرەکان فۆڕمەکانی بگۆڕیّو لە هەمان کاتیشدا بیر (فیکر) دەتوانیّ گوزارشت لە خۆی بکات، ئەگەر هاتوو لە فۆڕمیّکی کۆنیش دابیّ...

ئەدەبی ئیسلامی لەسەر ئاستی کارکردن لەگەلّ فۆڕمە هونەریەکانو ڕواڵەتەکانی ژیان کە دژایەتی لەگەلّ چوارچیّوەی گشتی بڕوای یەکتاپەرستی نییە، فۆڕمەکان رەت ناکاتەوە، بەلّکو هەولّ دەدات ئەم فۆڕمانە بەکار بهیّنیّ بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی فیکرەکەی و بەرجەستەکردنی دیاردەکانی ئەم چوارچیّوەیە، تەنها ئەم جۆرە فۆڕمانە رەت دەکریّنەوە کە نەتوانریّ لە ناوەرۆکە گەندەلّەکەی جیا بکریّتەوە.

داهیّنانی ئەدەبی لە چوارچیّوەی ئیسلام یان سەرمایەداری یان سۆسیالیزمی لە جەوهەرەکەیدا دەگۆڕیّ، بەپیّی روئیای فیکری بۆ گەردوونو ژیانو مرۆ،ئەم چوارچیّوە گشتییەش بۆ تیّگەیشتنی پەرەسەندنی رەگەزەکانی ئەدەبەو، بلیمەتی تاكو رووی شارستانی چەرخیّك لە چەرخەکانی بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە، لەسەر ئەوە سنوریّك نییە بۆ وەستانی رەگەزەکانی ئەدەب، ئەوە بەردەوام نویّ دەبیّتەوە تاکو مرۆ لەم سەر زەمینەدا مابیّ..

ئەوەش لەگەلّ مەنتیقی روئیای ئیسلامدا بۆ ژیان یەك دەگریّتەوە، ئەو روئیایە باوەڕی بەوە هەیە کە ئەو نویّکردنەوەیە مل کەچی باری ئەو شارستانیەتە دەبیّ کە نەتەوەیەك لە نەتەوەکان مل کەچی دەبیّ.

ئـەوە نوێکردنـەوە نییـە کـە هەمووشـتێکی شارسـتانیەتەکان بـۆ یەکێکی دیکە بگوازێنەوە بەبێ ئەوەی لامان گـرنـگ بـێ‌و پێویـستمان پێی هەبێ، هەروەکو ئەو بۆچوون‌و دۆگمایانەی لـە ئـەورووپا سـەریان هەڵدا لە ئەنجامی شڵەژانی باری دەروونی کەسانی ئـەو وڵاتانـە دوای جەنگە جیهانیەکان هاتنە ئاراوە.

## ئەدەبی ئیسلامی و جوانگەرایی( ئەستاتیکا )

ئـەدەبی ئیـسلامی دان بــە گرنگــی تــوخمی جــوانی دەنــێ، بــە وروژاندن‌و هەڵچوونی پێویست لە دەروونی خوێنـەردا، بـەڵام لەسـەر زمان‌و وێنەو سۆز رای ناگرێ ، بەلایەوە تـەنها ئـەو جوانییـە کـار لـە خوێنـەر ناکـات‌و نـای وروژێـنێ بـەڵکو زۆر شـتی تـر هەیـە کـاری لـێ دەکەن وەکو فیکرو حاڵەتی دەروونی خوێنەریش رۆڵی خۆی هەیە.

قورئـان لـە (٨ ئایـەت) دا باسـی (جوان‌وجـوانی، جمیل‌وجمـال)ی کـردووە، لەجێگەیەکدا جـوانی هەسـتی و لـە (٧ شـوێن)ی تـر باسـی جوانی (معنوی‌و خلقی) دەکات، مەرج نییە هـەموو جوانیـەك سـوود بـەخش بـێ یـان هـەموو جوانیـەك زیـان بـەخش بێـت، لـە ئـەدەبی ئیسلامیدا، جوانی بە بەهای هەق‌و خێر بەستراوەتەوەو لە ئیسلامدا زەرەرمەند جوانی نییە.

ئـەدەبی ئیـسلامی نزیکـە لـە خـوودی مـرۆڤ و گوزارشـت لـە بـارە هەمەجۆرەکانی وەك چێژو خۆشی و شادی‌و هەست بە جوانی کردن دەکات.. تەنها ئەوەیە کە ئیسلام وەکو لێزانێك لە ویـستەکانی مـرۆ.. بۆ هەر ویستێك هەقی خۆی دەداتێ، بۆ هەر چێژێك پێویستی خـۆی

لــه تێربــوون دەداتــێو هــیچ ویــستو چــێژو غەریزەیــەك بەســەر ئەویتردا زاڵ ناکات..

ئــەدەبی ئیــسلامیی جــەخت لەســەر جوانکــاری ناکــات، ئەوەنــدی جــەخت لەســەر هــەق دەکــاتو جــوانی ئامــانجی ئــەو نییــە، لەهــەمان کاتیشدا ئەوەندەش هۆگری ئەو ڕێبازانــە نییــە کــە گرنگــی بــە فیکــر دەدەنو بەهای جوانی لەدەست دەدەن، لێــرەدا لەگــەڵ هەنــدێ ڕێبــاز یەك دەگرێتەوەو لەگەڵ هەندێکی دیکەش جیاوازیان هەیە.

کــاتێ ئــەدەبی ئیــسلامی داوای هــەق بــە شــێوە هونەریەکەیــەوە دەکاتو هەقێکی جوانی مەبەستەو، دژی لایەنی سۆزو (جنس) نییە، بەڵکو هەوڵ دەدات، وێنەی ئــەو سۆزوهەســتە بــە پێــوەرێکی شــەرعی بەرجەســتە بکــات، ئــەدەبی ئیــسلامی لــە پانتــایی و بــواری خۆیــەوە لایەنێك بۆ وێنەکێشانی ئەم سۆزو جنسە دادەنێ، بەبێ ئــەوەی ببنــە هۆی وروژاندنی جنسی لای خوێنەر،

## ڕەگەزی شیعر لە ئەدەبی ئیسلامیدا :

هـــەر لەوکاتـــەی (ئەرســـتۆ) بـــەرگری لـــە شـــیعر کـــردوو دژی بیروبۆچوونی مامۆستاکەی (ئەفلاتون) وەستا کە شیعری بــە کــارێکی چــەوتو سەرچــاوەی پیــسی و گەنــدەڵی دانــاو بــە شایــستەی زەیــنو زیرەکــی مۆرڤایــەتی نــەزانی.. ئەوکاتــە (ئەرەســتۆ) بانگەشــەی بــۆ وەزیفــەی شــیعر کــردوو تیــۆری (هونــەر لــەپێناو هونــەر)ی ڕەت کردەوە..

(گۆته)•• شاعیری گەورەی ئـەڵمانی.. کـاتێ باسـی کۆمـەڵگای خـۆی دەکـات، دەڵـێ: (کۆمەڵگایەکـە مەحاڵـە شـیعری تێـدا بـژی).. ئـەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە خەرکە شارستانیەتەکەیان شیعر لەناو دەبات. [٧٠]

شاعیرو رەخنەگری ئینگلیزی (سـتیڤن سـپندر) دەڵـێ: ئـەو خـۆش بەختانەی کە توانایەکی باشیان لە تێگەیشتنی شـیعر هەیـە، ئیمـرۆ لـەم بڕوایـەدان کـە شـیعر هونـەرێکی مـردووە.. ئـەوەش گـەر وابـێ.. ئەوە دەگەیەنێ کە هەڵوێستی شیعریش بەرامبەر ژیان مردووە. [٧١]

لە ئەدەبی ئیسلامیدا شیعر، تا مرۆ مابێ هەر دەمێنێ.. بـەڵام کـام شـیعر؟ (میخائیـل نیعمـە) بـۆ وەڵامـی ئـەم پرسـیارە دەڵـێ: (ئـەو شـاعیرەی هەقـە پێـی بـوترێ شـاعیر دەبـێ هـیچ شـتێك نەنووسـێو بـاس‌و وەسـفی هـیچ شـتێکیش نـەکات.. ئەگـەر بەچـاوی رۆحیانـەی خۆی نەیبینێ.)

شـیعر لـە رۆژئـاوا خەریکـە هـەرەس دێـنێ.. ئاشـکرایە کـە ئیمـرۆ شیعری داستان (ملحمی) نەماوە، شیعری شـانۆگەریانەش•• پەخـشان جێگەی پێ لەق کردو شیعری فێرکـردن (تعلیمـی) ـیش بـاوەڕی پـێ نەماوە.

رادەی ئەندێـشەو سـۆز لـە شـیعردا لـە هـەموو هونـەرێکی دیکـە زیاترە، بۆیە شاعیر پاڵێوراوە بۆ کەوتنە نـاو بازنـەی (وەهـم) کـە لـە حاڵەتی نەخۆشی نزیکی دەکاتەوە، گەرهاتوو چاودێروو سانـسۆرێکی خوودی نەبوو کە (الذین آمنوا) پێی هەڵدەستن..

ئـــەوە شـــاعیرەکانمان وەکـــو شـــاعیرە ئەورپیـــەکان دەکەونـــە ژێـــر کاریگەری تـوخمی (وەهـم) کـە ئـەوان بـە (هـەرێمی نائاگـا) نـاوزەدی

دەکـــەن کـــە بووەتـــە سەرچـــاوەی رێبـــازی (ســـوریالی) و پاشـــان (ناماقولّیـەت)، کـە تێیـدا شـیعر بووەتـە پەتایـەکی تێکـدەرو بـەلای ئـەوان ئـەو چامەیەی دەکەوێتـە ژێـر کاریگـەری مـەیو ئـەفیون بـە باشترین چامە دادەنرێ، چونکە لە پەیوەندییەکانی ئاگایی و ئـەقلّو هۆش دەردەچێ، بـەو مەرامـەی کـە بـەم جۆرە شـاعیر راسـتگۆ دەبـێ لەگـــەلّ خـــوودی خـــۆیو دوور لـــە پەســـتانی ســـانســـۆرو زەیـــنو دەسەلاّتوکۆمەلّ.

ئەدەبی ئیسلامی ئەو جیاوازییە دەدۆزێتەوە لەنێوان کەوتنـە ژێـر ترسناکی سۆزو ئەندێشەی زێدەهەلّچوو و لە نێوان حالّەتی شپرزەیی هاوسـەنگ (التـوتر المتـزن) کـە لـە شـاعیری موسـلّمان روو دەدات، بـۆ رەچـاوکردنی حالّەتـە دەروونیەکان،کـە لـە ئـەنجامی زولـّمو سـتەمو کوشتنو برِینو وون بوونی شتە پیرۆزەکان سەر هەلّدەدەن.

## رۆلی ئەدەب لە گەشە پێدانی هزرەکان

بەدرێژایی مێژوو هەر لەوەتـەی مـرۆڤ هاتۆتـە بـوون، هـەولّی داوە بیرۆکەیەك بۆخۆی دابرِێـژێو کـاری رۆژانـەی لەسـەر بکـات، سـەرەتا مرۆڤ هزرو بۆچوونی تەنها بۆئـەوەبوو کـە بـەر پێـی خـۆی ببـینی و مەئواو پێ خۆری رۆژانەی خۆی پێ دابین بکـات، بـۆ ئـەم حالّەتـەش سەرەتا بۆ ئەم دابین کردنانە هەرکەسەو بیری خۆی هـەبووە، پاشـان وردە وردە مرۆڤــە بــە تواناکــان لــە رِووی ئــەقلّی و جەســتەییەوە،

هـەوڵیان داوە چەندکەسـێك بکەنـە هـاوبیری خۆیـان بۆئـەوەی ئـەو بیرەی هێناوێتیە کایـەوە، زیـاتر کـاری پـێ بکـرێو، زیـاتر بەرهـەمی رەنجی رۆژانەی پێ بێتەبەر، ئەوسا ئەوکەسە بە تواناو ئەقەڵ دارانە توانیویانە گروپێکی هاوبیری خۆیان دروست بکەن.

بـەمجۆرە کۆمەڵگەی مرۆڤایـەتی لـە رووی فیکرییـەوە بـۆ چـەندین گروپـی جیاجیـا دابـەش بـووە، دواتـر بیریارەکـان کەوتوونەتـە دۆزینەوەی رێگەی جۆراوجۆر بۆ سەقامگیرکردنی بیرەکەیانو، پاشان بڵاوکردنـەوەی ئـەم بیروبۆچـوونە لـە هـەموو سوچـێکدا، ئـەم بۆچوونانەش لـە ڕووی راسـتی و چـەوتیەوە هەمـە چەشـن بووینـەو لەوکاتـە بیرراسـتو بیرچـەوتەکان، زیرەکـی و کارامـەیی خۆیـان خستۆتە گەڕ بـۆ سەرخـستنی بـەردەوامی بیرەکـەیان، بۆیـە دەبیـنین مێژووی بزاڤی زۆر لە سەرکردەو هزرمەنـدانی بوارەکـانی ژیـانی لـە پەڕاوگـەی خـۆی تۆمـارکردووە ،کـە هەنـدێکیان بیرەکـەیان بـۆ سەرفرازی مرۆڤایەتی خستۆتە گەڕو، هەشبووە ئەم زیرەکییەیان بـۆ چەوساندنەوەوخـستنە ژێـر رکێفـی خۆیـان بـەکار هێنـاوە، یـەکێ لـە بـەربڵاوترین رێگـە بـۆ بڵاەبوونـەوەی بیروبۆچـوونەکان هێرشـی سەربازی بووە، ئەوەندەی هێرشی سەربازی بۆ فراوانکردنـی رووبـەر خـاكو زەوی وڵاتەکـەیان بـەکار هـاتووە ئەونـدەش بـۆ خـستنە ژێـر رکێفی بیروبۆچوونی تایبـەت بـەکارهێنراوە، مێـژووش گـەواهی ئـەم هـەموو شەڕوشـۆڕو سـووتانو رووخـانو کوشـتنو چەوسـاندنەوانەیە کە مرۆڤ لە برای مرۆڤی کردووە.

هەر لە پەیامبەرەکانەوە تاکو ناودارانی وەك سەرمەزهەبەکانو تێکڕای بنەماڵەی پێغەمبەران (درودو سلاوی خوایان لەسەربێت) و چەندانی وەك سوقراتو گالیلۆو ژان دارکو حەلاجو هەموو نوێ کەرەوانی ئایینی موسڵمانان لەم سەدەیەدا گەواهی ئەم بۆچوونەمان دەدەن.

یەکێکی دیکەو لەو رێگە گرنگانەی کە بۆ بلاوکۆردنەوەی هرزو بیربەکارهاتوون رێگەی ئەدەبو هونەرە، بەتایبەتی ئەدەب بە هەموو رەگەزەکانیەوە بگرە هەر لە دەقە پیرۆزەکانەوە تاکو سادەترین پەخشان، بۆ گشەپێدانی بیرو بۆچوونەکان هاتوون، هزرمەندانیش بۆ ئەم کارە دوو جۆر بووینە، یەکێکیان دەقی ئەدەبی و هونەری خۆی نووسیوەو لەکاتی خوێندنەوەی دەقەکاندا چێژی لە خوێنەرانی وەرگرتووە، جۆری دووەم چێژی لە وەدەست هێنانو بلاوبوونەوەی بۆچونەکەی لەڕێگەی ئەدەبو هونەرەوە وەرگرتووە، ئەمەش لەبەر ئەوەبووە کە زۆرێك لە سەرکردەو دەسەلاتداران بە هەمووجۆرێك بە شانو بالی شیعرو شاعیرانیان هەلگوتووەو یان عەودالی تابلۆیەکی سەرنج راکێش بووینەو، شوێنو سەکۆی تایبەتیان بۆ داناون... بەتایبەت شاعیران، کە شاعیری وا هەبووە لەسەرا پەردەی کۆشی شادا پلەی وەزیرێکی کارای هەبووە و لە دەسکەوتو بەرکەوتی جەنگەکاندا سەرپشك بووە.

## هرزو ئەدەبو هونەر لە مێژووی کۆندا :

هــەروەکو لــە ســەرەتا باسمــان کــرد لــە رێگــە کاریگــەرەکانی بڵاوبوونــەوەی بـیرو بۆچـوون ، رێگـەی ئـەدەبو هوونـەر بـووە، بـە درێژایی مێژوو، مێژووی کـۆنو مرۆڤایـەتی لایـەنێکی گرنگـی ژیـانی رۆژانــەیان شەڕوشـۆڕو داســتانی پاڵــەوانێتی کەســانی ســەرکردەو دەسـەڵاتدار بـووەو هەریەکـە لـەو کەسایەتیانە، هـەوڵی داوە بـەهۆی نووسـەرێك یـا شـاعیرێك سـەربوردەو بەسـەرهاتی رۆژانـەی خـۆی لـە تۆمارگـای مێـژوو تۆمـار بکـات ، گـەر سـەیرێکی هـەردوو داسـتانی ئـەلیازەو ئودیـسای هـۆمێرۆس(٨٥٠ پ ز) بکـەین دەبیـنین سـەرجەم داســـتانەکەی پاڵـــەوانێتی( ئـــەخیلو ئودیـــسیۆس) دەردەخـــاتو بیروبۆچـوونی هومێرۆسـی شـاعیر دەربـارەی ڕووداوەکـانی سـەدەی دوانزەی پێش زاین دەسەت نیشان دەکات، چونکە زۆربەی لێکۆڵـەران لەم باوەڕەدان کە هەردوو داستانەکە، ڕووداوەکانی لـە درووسـتکردنی خـودی شـاعیرەکان بـووە ، شـاعیر ویـستوویەتی مەبەسـتەکەی لـە میانـەی ئـەم دوو داسـتانە بخاتـە بەردیـدەی خـەڵکی، هـومێرۆس لـە میانـەی داسـتانەی شـیعریەکەی دا هەرچـی سـادەیی و شـکۆمەندی و پیاوچاکی پاڵەوانە سەرەکیەکانی هەیە، دەری خستوون.

هەروەها (کایوس) شاعیری یۆنانی گەورە( کە ٦٠٠ساڵ پێش زایـن کۆچــی دوایــی کــردووە) هــەموو شــیعرەکانی بــۆ پەرەســەندنو بڵاوبوونــەوەی بۆچـوونو سیاســەتی ئەوســای (ئەســینا) تــەرخان کردووە.

هــــەروەها هــــەموو بــــیرو بۆچــــوونەکانی( ئــــەفلاتوون٤٢٨ _ ٣٤٧ پ٠ز ) لەم چەند وتارانەدا خۆیان دەبیننەوە، کە لەماوەی ژیانی دا ئاراستەی خەڵکی وڵاتەکەی کردوون، ئەم وتارانەش زۆربەیان لە ژێر کاریگەری بۆچوونی(فیساغورس)یەکان بووە، دوای ئەوەی (جوستیان)ی ئیمپراتۆر قوتابخانە فەلسەفیەکانی داخست، لە ساڵی (٥٢٩ پ ٠ز)، لەوکاتــەی( ئــەفلاتوون) ئەکادیمیــەی تایبــەتی خــۆی کردەوە، کە هەموو زانستە سیاسییەکانی تێدا دەگوتراوە، پاشان هەموو بۆچوونەکانی لە کتێبی( کۆماری ئەفلاتوون) بلاوبوونەوە.

دوای ئەوەی( زینۆ ٣٠٠ ساڵ پ ز) فەیلەسووفی ئەغریقی رێبازی (الرواقی) دامەزراند، بۆئەوەی بیگەیەنێتە هەموو خەڵکی لە ڕێگەی نووسینو پەخشانەکانی بلاوی کردنەوەو، دواتر هەر بەهەمان ڕێگە (سینکاو ئەبیکتیتو مارکۆس) هەوڵی بلاوکردنەوەیان دا.

هەروەها دوای ئەوەی( ئەبیقور ٣٤٢-٢٧١پ ز) فەیلەسوفی یۆنان قوتابخانەی تایبەتی خۆی لەژێر ناونیشانی(باخچە) دامەراند کە بیروبۆچوونە تایبەتییەکەی خۆی دەربارەی گەردوون و ژیانو چێژ پەرستی، تێیدا بەرچەستەبوو ، دواتر بۆ درێژە پێدانی بلاوکردنەوەی بۆچوونەکانی ڕێگەی ئەدەبی هەڵبژارد کە سەرجەم بۆچوونەکانی لە چەند چامەیەکدا دارشت.

(ئەریستۆڤانستی ٤٥٠-٣٨٥پ ز) شاعیرێکی ناوداری یۆنانی بوو، کە سەرجەم شیعرەکانی بریتی بوون لە دەرخستنی بیروبۆچوونی خۆی دەربارەی ئایینو پەروەردە لە ئەسینا، بەردەوامیش لە شیعرەکانیدا هێرشی دەکردە سەر دامودزەگا دیموکراسیەکانی ئەسیناو گاڵتەی بە

سیاسەتمەدار و هزرڤانانی دەکرد، کە هە بە قسە دیمـەکراتخوازبوون، ئـەم دام‌ودەزگـا بـەناو دیموکراسـیانەی کۆتاییـان بـە ژیـانی(سـوقرات ٤٦٩، ٣٩٩ پ ز)  هێنا.

نموونەو وێنەی زۆری ئەم هزرڤانانـەمان لەبەردەسـت دایـە کـە بـۆ پەرەپێدانی بۆچوونەکانیان لە ڕێگەی ئەدەبەوە توانیویانە بچنە ناو زۆربەی خەڵکی.

## کاریگەری ئیسلام وەك بیرێکی نویٚ لە سەر کۆمەڵگای ئەوسایدا :

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد ئیسلام هەر لەکاتی سـەرهەڵدانییەوە ، خـاوەنی بیرێکـی نـوێو هـەڵگری پـەیامێكو بانگـەوازێکی ئـاینیو کۆمەڵایـەتی و رامیـاری بـوو و لەسـەر  بنـچینەی بـاوەڕ بـە تاکـە خوایـەك و، مـل کـەچ کـردن بـۆ خـوای تـاكو تـەنیا و لـە بـەدکاری دوورکەوتنەوە دامەزرا.

ئیـسلام بـۆ دامەزرانـدنی کۆمەڵگایـەکی نـوێی یـەکگرتوو، بـۆ بـەهێزکردنی پەیوەنـدی ئـادەمیزاد لـە هـەموو بوارەکـانی ژیانـدا بـە ئـادەمیزادەوە دەدات... هـات..، ئیـسلام لـە رووی کۆمەڵایەتییـەوە یـەکێتی کۆمـەڵی چەسـپاندوو ریـشەی رەوشـت وخۆشەویـستی و بەیەکەوە ژیانی ئەندامانی کۆمەڵی داکوتا.

بـە هـەموو گـوڕەوە هـەوڵی دا رەگـی رەگەزپەرسـتی و دەمـارگیری خێڵەکی ریشەکێش بکات.

لە ئەنجامی ئـەم بیربۆچـوونەی ئیـسلامدا، کـە موسـڵمانانی پێـشوو هەموو هەوڵێکیان بۆ هێنانە دی ئامانجەکانی بوو، سـەر لەبـەر بـوون

بـەهۆی یەکخـستنی دەمـارگیری خێڵـەکی و بەرزبوونـەوەی یـەکێتی ڕیزەکانی کۆمەڵو پەرەسەندنی نما بـەرزە مرۆڤایەتیـەکان، ئـەوەش شـتێکی خواسایی بـوو کـە شۆڕشـێکی لـە ژیـانی ئـەو سـەردەمەدا بـە هەموو ڕەنگێگ هەڵگیرسێنێو ئەم بـارە چـەوتەی پـێش پەیـدابوونی ئیسلام ڕاست بکاتەوە، ئەم هەموو گۆڕانکاریانەش، لەو قۆناغـەدا کـە کارێکی گەورەیان لەنێوەرۆکی ئەدەب کـرد. لـەژێر سـایەی پێغەمبـەر (درودو سلاوی خوای لەسەربێت) و هاوەڵەکانی بن چەسپ ببوو.

دوای ئـەوەی موسـڵمانان هەوڵیانـدا کـە سـنورێك دابمـەزرێنن کـە مەدینەی پێ بپارێزنو ئەوسا دەست کرا بـە جـەنگی بـەدری گـەورە، شـیعر لـەو هـەموو گۆڕانکارییانـە بـەردەوام ئامـادە بـوو و، بەرهـەمو ڕەنگدانەوەی ئەم گۆڕانکارییانەبوو، ئەگەر لـە دیوانەکـەی (حەسـانی کـوڕی سـابت) ووردبینــەوە ئــەم ڕاسـتیانەمان بــۆ دەردەکــەوێ، کـە(حـسان) پــێ بــەپێ شـیعری لەگـەڵ هـەموو هـەنگاوێکی ئــەم گۆڕانکارییانەدا گوتووە.

پێغەمبەری موسڵمانان (درودو سلاوی خوای لەسـەربێت) ڕێزێکـی زۆری لـە شـاعیرە ئیمانـدارەکان گرتـووە،نـرخو بەهایـەکی زۆری لـە شـیعرەکانیان نـاوە، پێغەمبـەر (درودو سـلاوی خـوای لەسـەربێت) هـەوڵی دەدا شـاعیرە ئیمانـدارو خواپەرسـتو ڕاسـتگۆیەکانی لـەخۆی نزیك بکاتەوە، داوای لێ دەکردن، بۆ سەرفرازی ئیسلامو بـەرگری لـە هێرشی دوژمنان، شیعری بەهێزو پێزو ڕاستو ڕەوان بهۆننەوە، هـەر بـە هـۆی ئـەوەبوو کـە ئـەم شـاعیرانە لـە دواڕۆژدا بوونـە زمانحـاڵی بانگەوازی ئیسلام .

ئەمەش ئـەوە دەگەیـەنێ کـە شـیعری شاعیران کاریگەرییـەکی بـێ وێنــەیان لــە بڵاوبوونــەوەو ناســاندنی بــیری ئیــسلامی دا هــەبووە، ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەو سەردەمەدا چاکترین ئامراز راگەیانــدن بــووەو لــە بــڕی هــەموو ئامێرەکــانی دەنــگو رەنــگو بڵاوکراوەکـان کایگـەری خۆیـان لەسـەر خـەڵکی بـووەو، شـیعریش لـە هـەموو هـەواڵێك زیـاتر بـە خێراییـەکی بـێ وێنـە لـەناو خەڵکانـدا بڵاوبۆتەوە.

## گەشە پێدانی هزر لەڕێگەی ئەدەبەوە لە سەردەمی ئەمەویەکان

ئەمەویــەکان وەکــو هــەموو عەرەبــە کۆنــەکانی نیــوە دوورگــەی عــەرەب، خۆیــان لــە قــەرەی فەلــسەفە نــەداوە، بــەڵکو ئــەوەی کــاری لێــدەکردن زیــاتر وتــاری رەوانو شــیعری بــاش بــووەو، زۆربــەی دەســەڵاتدارانی ئەوســاش چــێژیان لــە شــیعر وەرگرتــووەو زۆریــشیان شاعیر بووینە، ئەمەویەکان دەیانگوت شیعر بە مەلیکێك دەستی پـێ کــرد مەبەســتیان (أمــرؤالقیس)ەو بــە مــەلیکێکیش کۆتــایی هــات، ئەمەش مەبەستیان (یەزەید کوڕی مەعاویە)بوو٠

دواتر بنەماڵەی ئومەییـە بـۆ سـەقامگیری دەسـەڵاتیان و بـەردەوام بونیان، شوێنی تایبەتیان بۆ شاعیرانی لێهاتوو و چاك دانـاو خـەڵاتو دیاری بێ ژماریشان پێ دەدان.. بـە تایبـەتی لـە سـەردەمی (عەبـدول مــەلیکی کــوڕی مــەڕوان) کــە خۆشــی شــاعیرێکی بــاش بــوو و، لــە ســەردەمی ئــەو تــوانرا بــیرو بۆچــوونی خۆیــان دەربــارەی دەســەڵاتو دەستەمۆکردنی خـەڵکی زیـاتر پـەرە پـێ بـدەن، ئەمـەش لـە ڕێگـەی

هەندێ لە زانا ئاینیەکان کە بە پێی خواستی ئەوان فەتوایان دەداو، دواتریش لە ڕێگەی ئەدەبەوە بەتایبەتی شیعری شاعیران، لەم شاعیرە لێهاتوانەش کە بۆ ئەم مەبەستە دەخرانە گەڕ (جەریر و ئەختەلو فەرەزدەق) بوون، لە گۆڕەپانی شیعردا ئەسپی پڕتەوی خۆیان تاو دەداو لە هەموو دەریاکانی شیعریان دەداو، کاریگەرییەکی بێ وێنەیان لەسەر خەڵکی ئەدەب دۆستی ئەو سەردەم هەبوو، ئەمەش وای لە بەرەی بەرامبەر کرد کە شاعیرانی خۆیان هان بدەن کە لە کاریگەری ناوەرۆکی شیعری شاعیرانی ئەمەوی کەم بکەنەوە.

## گەشە پێدانی هزر لە ڕێگەی ئەدەبەوە لە سەردەمی عەباسیەکاندا

لە سەردەمی عەباسیەکاندا شاعیرێکی زۆر پەیدابوونو،دەکرێ بڵێین کە لێهاتووترین شاعیران لەو سەردەمە بوون، لەو سەردەمەدا جگە لە عەباسیەکانیش هەر گروپو ڕێبازێکی فیکریو ئاینی چەندین شاعیری خۆی هەبوو بۆ پارێزگاری کردن لە بیرو بۆچوونەکانیان... بەتایبەتی شاعیرانی بەرهەڵستکار، کە بەردەوام هانی خەڵکیان دەدا کە دژی ستەمی خەلیفەکانو دەسەڵاتدارانی عەباسی ئەسپی شیعریان تاوبدەن، شاعیرانی عەباسی لە جەنگەکانی ڕۆم دا ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبوو، کە بە شیعرە ئاگرینەکانیان هانی موسڵمانانیان دەداو سەرکەوتنەکانی موسڵمانانیان بە شێوەیەکی جوان بە شیعرەکانیان دەڕازاندەوە، لەپێشەوەی هەموویان شاعیری گەورە (ئەبولعەتاهیە)بوو.

هەروەها لە گۆڕەپانی (پەخشان)یشدا سەردەمی عەباسیەکان بە سەردەمی زێڕین ناوزەد دەکرێ، یەکێ لە پێشەنگانی ئەو سەردەمە (عەبدوڵڵای کوڕی موقەفەع) بوو کە بە وەرگێڕانی کتێبە فارسی و هیندییەکان توانی بیروبۆچوونی ئاینی و نەتەوەیی ئەم نەتەوانە بێنێتە ناو کۆمەڵگەی عەباسییەوە، ئەم نووسەرە بەهۆی ئەم چیرۆکانەی کە لەسەر زمانی گیانداران (بەیدەبا) نووسیویەتی، توانی بیروو بۆچوونی ئەم فەیلەسووفە لەناو خەڵکی بڵاوبکاتەوە، کە ناواخنی زۆربەیان هاندانی ستەم لێ کراوان بوو، لە دژی دەسەڵاتداران دەخرانە گەڕ، ئەم نووسینانە تاکو ئەمڕۆکەش لە تام و چێژی مانداری خۆی نەکەوتوون و دوای ئەم کتێبانە چەندین کتێبی تر مەبەستی خۆیان لەسەر زمانی گیانداران خستە بەر دیدەی خوێنەرانی.

## شیعر لەنێوان ململانێی فیکری عەباسیەکان و عەلەویەکان دا

دوای شەهیدبوونی حوسەین کوڕی عەلی، عەلەویەکان هەموو ڕێگەیەکیان گرتەبەر بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان، دوای ئەوەی عەباسیەکان خەلافەتیان گرتە دەست.. پاش ماوەیەك عەلەویەکان تێگەیشتن کە عەباسیەکان فێڵیان لێ کردوون و، بەتەنیا بۆخۆیان کەوتنە گەنجینەی خەلافەت و ئەوانیان خستە پەراوێزەوە، بۆیە کەوتنە دوژمنایەتی عەباسیەکان، جارێکیان بە شەڕوشۆڕ و جارجاریش بە وتارو شیعر، هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشەکانی (محەممەد-النفس الزکیە)و براکەی لە سەردەمی(مەنسور)داو شۆڕشی

حوسەین کوڕی عەلی کوڕی حوسەین لە سەردەمی (الهادی) و شۆڕشی (یەحیاو ئیدریس) لە سەردەمی هاڕونە ڕەشیدو شۆڕشی (محەممەد دیباج کوڕی جەعفەری صادق) لە سەردەمی مەئمون، چەندین شاعیری عەلەوی کەوتنە خۆو، ئەوەی باش‌و گونجاو بوو بە شیعرە پاراوو ئاگرینەکانیان، ئەیان دایە پاڵ بیروبۆچوونی خۆیان‌و،ئەوەی گەندەڵ ونەگونجاویش بوو دەیاندایە پاڵ عەباسیەکان و شیعرەکانیان ئەوەندە کاریگەربوون‌و کارێکی وایان کردە سەر خەڵکی، کەوایان لێ هات بە لێشاو بەرەوپیری بانگەوازەکەیانەوە دەهاتن..

عەباسیەکانیش بۆ بەرگری کردن لە خۆیان‌و خۆپاراستنیان لە شیعرە گوڕدارەکانی عەلەویەکان، کەوتنەخۆ بۆ کۆکردنەوەی چەندین شاعیری لێ هاتوو و، پارەو سامانێکی زۆریان بۆ تەرخان کردن، گەر چاوێك بە شیعری شاعیرانی ئەم دوو لایەنە دا بخشێنین بۆمان دەردەکەوێ کە هەموو هونەرێکی شیعریان بەکارهێناوە بۆ گەیاندنی بیروبۆچوونەکانیان و سەرخستنی لایەنێك بەسەر لایەنەکەی دیکەدا،

بۆ ماوەیەکی زۆر بەهۆی کاریگەری شیعرەکانیان توانیان کۆمەڵانی خەڵکی سەردەمی خۆیان بۆ لایەنێك لەلایەنەکان پەلکێش بکەن‌و ئاگری جەنگ‌و ململانێیان پێ خۆش بکەن، بۆیە لەو سەردەمەدا کاریگەرترین چەکی ڕاگەیاندن شیعر بووە، لە شاعیرە بەناوبانگەکانی عەلەوی و لە سەردەمی ئەمەویەکان (کوسەیر عەزە-١٠٥ ك) و (ئەلکەمیت- ١٢٦ك) و ( سەید حومەیری ١٧٣ ك) و

(دوعبلی خوزاعی) بوون هەروەها لە سەردەمی عەباسیەکان دا هۆی سەرەکی بڵاوبوونەوەی بیروبۆچوونی ڕێبازی (کیسانییە) کە باوەڕیان بە ئیمامی (محەممەد کوڕی ئەلحەنەفیە)بوو، زمان پاراوی و لێهاتوویی (سەید حومەیری) شاعیر بوو کە کاری زۆری کردە سەر گۆڕینی بۆچوونی خەڵکیو هانی دان بۆ وەرگرتنی ئەم ڕێبازە.

هەروەها (دوعبلی خوزاعی) کە یەکێ بوو لە هەرە شاعیرە بەناوبانگەکانی عەلەوی بە شیعرە پڕ ماناو سۆزدارەکانی توانی هەزاران کەس بێنێتە هەژانو بیانکاتە هەواداری بنەماڵەی (عەلی کوڕی ئەبوتالیب)، ئەوەندەش زەمی عەباسیەکانی کرد ، تا وای لێهات لەلایەن خەڵکی ناشیرینو ناماقوڵ بن، هەربۆیەش بوو وەکو (ئەلتەبەری) دەگێڕێتەوە کە(موعتەسەمی خەلیفە) بڕیاری کوشتنی دەرکرد، بۆیە تا لەژیان دا مابوو پەڕاگەندەی وڵاتان بوو و دوا مەنزڵی مەغریب بوو.

لەبەردەم ئەو شاعیرانەی عەلەویشدا شاعیری گەورەی عەباسیەکان (مەڕوانی کوڕی ئەبی حەفسە) بوو کە بەردەوام لەگەڵ شاعیرانی عەلەوی خەریکی شەڕە شیعر بوون، پێشتریش ئەم شاعیرە یەکێ لە شاعیرە هەرە نزیکەکانی کۆشکی خەلیفەی ئەمەوی (مەڕوان کوڕی محەممەد) بوو و بەردەوام لەگەڵیدا بوو و ڕووداوە سیاسیو جەنگەکانی ئەوسەردەمی بە شیعرەکانی تۆمار کردووە، پاشان کە دەوڵەتی عەباسی دامەزرا خەلیفەکانی عەباسی نەیان توانی دەست بەرداری شیعرە ئاگرینەکانی ببن بۆیە لەجیاتی لەناوبردنی ،

هەوڵیانـدا بیکەنـە لایـەنگری خۆیـانو پـارەو پـوولێکی زۆریـان بـۆ تەرخان کرد.

ئەمـەش وای لـە عەلەویـەکان کـرد کـە هـەوڵی لـەناوبردنی بـدەن، دوای ماوەیەك، بە ئامانجی خۆیان گەیشتن و توانیان لەناوی ببەن.

## کاریگەری شیعرو نووسین لەسەر بیرو بۆچوونەکان دا

زۆربـەی ئـەدیبو نووسـەران بـە درێـژایی مێـژوو، راسـتەوخۆ یـا ناڕاستەوخۆ بە نیەت پاکی یا بە فیتی نەیاران کاریگەریەکی زۆریـان لـە لەسـەر گەشـە پێـدانی هـزرو لەسـەر گۆڕانکارییـە ئـابووریو کۆمەلأیەتی و سیاسیەکان هەبووە..

ئـەدیب و نووسـەران ئەوەنـدەی چـوونەتە پـاڵ سیاسـەتمەدارو دەسەلأتدارانو ئەرکی (سیاسەت –ئایدۆلۆژیا) یان لە ئەسـتۆ گرتـووە و کەوتوونەتـە ژێـر بـاری گرانـی ئایـدۆلۆژیا، دوور بووینـە لـە مەبەستو نیازی تایبەتی خۆیان، تا وای لێ هـاتووە بەرهەمـەکانیان چـۆڕاوگەو ویـستو مەبەسـتی دەسـەلأتداران بـووەو بۆچـوونی راستەقینەی ئەدیبو نووسەرانی تێدا دەکار نـەهاتووە.. هـەر لەبـەر ئەمەش بووە ئەوکاتەی شیعر وەزیفەی راسـتەقینەی خـۆی لەدەسـت داوە، هەندێ لە بیریاران لە شیعرو وتارەکانیان کەوتوونەتە ناڕەزایی دەربڕین، ئەوەتە (وەکو پێشتر باسمـانکرد)... (ئـەفلأتوون) لـە یـەکێ لـە وتارەکانیـدا دەڵـێ: (شـیعر شـیاوی پایـەی زیرەکـی مـرۆڤ نییـەو یەکێکە لە هاندەرانی گەنـدەڵی..) هـەروەها ئەرسـتۆ جـەخت لەسـەر ئەوە دەکاتەوە کە (شـیعر دەبـێ وەزیفـەو کاریگـەری خـۆی هـەبێ لـە

چـالاکی مرۆیـی) هـەروەها (تۆفیـق ئەلحـەکیم) دەڵـێ: (ئـەدەب ڕێگەیەکە بۆ بێدارکردنـەوەی بیروڕاو.. نـابێ نوسـەر خوێنەرەکەی بسرەوێنێ بەڵکو لەکاتی داخستنی کتێبەکە دەبێ ئازارەکانی دەست پێ بکەن...)

ئێمە ناتوانین لە نووسینێکی وەهادا ناوی ئەو هەمو ئـەدیبو نووسەرانە بێنینەوە کە ڕۆڵی کاریگەریان لەسەر گۆڕانکاریەکان لە بوارەکانی ژیاندا هەبووەو هەیە، تەنها چەند ناوێکی دیاروبەرچاو دێنینـەوە: (دیمۆستین-٣٢٢پ.ز) کـە یـەکێك بـووە لـە گـەورەترین وتاربێژانی یۆنان بـەهۆی وتـارە ئاگرینەکانیـەوە تـوانی ئەسینیەکان وشیار بکاتەوەو لەژێر دەستی(فیلبرۆس)ی مەگدۆنی رزگاریان بکات.

هـەروەها یـەکێ لـە هۆکـارە هـەرە گرنگـەکانی سـەرکەوتنی شۆڕشی(کرمۆیـڵ) دژی زوڵمو ستەمی شارلی یەکەم لـە ساڵی ١٦٤٩ز دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری شیعرەکانی(جۆن میلتۆن)، ئـەم شاعیرە بە شیعرەکانی هاوکارێکی کاریگەری ئەم شۆڕشە بـوو، هـەر بۆیـەش دوای سەرکەوتنی شۆڕشەکە لـە حکومـەتی ئەوسای ئینگلیـز کـرا بـە وەزیـری دەوڵـەت.. مەکسیم گـۆرگی(١٨٦٨ –١٩٣٦ز) یـەکێ بـوو لـە نووسـەرە هـەرە بەناوبانگـەکانی روسـیاو جیهـان، هـەموو لێکۆڵـەران لەسـەر ئـەم رایـەن کـەوا بیروبۆچوونی (لینینـزم) ئەوەنـدی بـەهۆی نووسینەکانی ئـەم کەلـە نووسـەرە لـەناو خـەڵك بڵاوبـووەو لـە دڵان سەقامگیربوو، بەهۆی هەموو زیرەکی لینینو زەبروزەنگی ستالین و گەورەترین سیاسەتمەدارەکانی روسیا بڵاو نەبوونەوە..

هەروەها یەکێ لە هۆکارە سەرەکیەکانی بەرپا بوونی شۆڕشی ئەسپانیا لە ساڵی (١٩٣٦ز) شیعرە کاریگەرەکانی ( سپندر ولی لویس و ئۆدین) بوون کە توانیان خەڵکی وشیار بکەنەوە لەو نەهامەتییە کۆمەڵایەتیانەی دەرهەق بە خەڵکی لەژێرسایەی حوکمڕانی ئەوسای ئەسپانیا ئەنجام دەدرا، (بیرتۆلدبرێخت ١٨٩٨-١٩٥٦ز) یەکێ بوو لەو نووسەرو شانۆ نووسانەی کە بارتەقای هەموو هێزە سیاسیەکان کاریگەری لەسەر هاندانی خەڵکی هەبوو دژی زوڵمو ستەمی نازییەکان، هەر لەبەرئەوەش بوو (هیتلەر) بڕیاری سوتاندنی هەموو کتێبەکانی داو لە ئەڵمانیاش شاربەدەری کرد.

(عەمرو کوڕی بەحری ئەلجاحیز ١٦٠-٢٥٥ ك) كە یەكەێك بوو لە هەرە كەسایەتییە فەرهەنگییەكان لە كەلتووری عەرەباندا، كتێبە چاپكراوو دەستنوسەكانی لە (٣٥٠ كتێب) زیاترنو گشتیان بریتین لە بابەتی ئابووری و فیكری و زمانەوانی و ئاینی، بە زمانێكی بەرزی ئەدەبی نووسراون و بەها ئەدەبیەكەی زاڵە بەسەر فیكری سیاسی و پەروەردەییەكەی..

لەپشت ئەم نووسینانەی ئەلجاحیز(الجاحظ ) بۆچوونێکی تۆکمەو پتەو هەبووە کە ئەویش بیری (المعتزلە) بوو، کە دواتر بیرو بۆچوونە تایبەتیەکانی ئەلجاحیز (الجاحظ) بوونە قوتابخانەیەکی سەربەخۆ لەژێر ناوی(الجاحظیة)و خەڵکانێکی زۆر لە دەوروبەری کۆ بووبوونەوە..

هاروەها هیچ زاناو وتاربێژێکی نیمچە دوورگەی هیندستان نەیتوانیوە ئەوەندەی(ئیقبال)ی فەیلەسووفو شاعیر بچنە ناو دڵو

دەروونــی خــەڵکی، کــە ئیمــڕۆ لــە سەرانــسەری جیهــانی ئیــسلامی دا شیعرەکانی ئەزبەر دەکرێن.

هەروەها (ئیمامی شافیعی – رەحمەتی خـوای لێبێـت) بـۆ پاڵپـشت کردنــی فیکــری خــۆی کانگــای شــیعری هــەڵقوڵاو وەکــو شــاعیرێکی پەیامـدار بـەرگری لـە بانگـەوازی ئیـسلامی کـردوەو ڕێ خۆشـکەری بۆچونە شەرعیەکان بووە...

(نــەجیب گــەیلانی) چــیرۆك نووســێکی بــەتوانا بــوو و زۆربــەی رەخنەگران گەواهی سوارچاکی ئەم کۆڕەپانەی بـۆ دەدەنو، چـەندین شــاکاری گــەورەی هەیــەو لــەڕووی بــەکارهێنانی تــەکنیکی نــوێو کەرستەکانی نووسینی چیرۆك... تابلێی بە توانا بووە..

بــەڵام لەگــەڵ ئەوەشــدا ئــەو هــەموو سوارچــاکییەی لــە گۆڕەپــانی ئەدەبدا خۆ ناساندنی وەکو چیرۆك نووسێك، شتێکی ئاشکرایە لـەلای توێــژەران کــە لــە پــشت ئــەم نووســینانەی نــەجیب گــەیلانی، بیروبۆچـوونێکی تۆکمـەو هەسـتی بانگـەوازی بـۆ ئیمـانو باوەڕەکـەی هەیە.. کاتێ چیرۆکەکانی دەخوێنیتەوە بۆت دەردەکەوێ کـە تێکـڕای چـیرۆکەکانی خـستۆتە خزمـەت بـیرو باوەڕەکـەی، وەکـو بیـەوێ بڵـێ ئەدەب لە بوارەکانی دیکەی ژیان وەکو سیاسەتو ئایینو کۆمەڵایەتی جیا ناکرێتەوەو هەروەکو بیەوێ بەگوێمان بچرپێنێ کە کۆڵەگـەکانی ژیانی مرۆڤ چەند شتێك بـن وەك (ئـاین، سیاسـەت، ئـەدەب، هونـەر) کــە هــەموویان لەگــەڵ پێویــستی ژیــانی مــرۆڤن، وەك پارچــە مۆسیقایەك کە بە چەند ئامێرێکی جیا جیا سەرتاپای ئاوازێك پێـك دێـنن، کـە هـەر پارچـەی جـۆرە ئـەرکێكو جـۆرە ئـاوازێکی هەیـەو

لەیەکیش ناچن‌و بەڵام لە ئاکامدا بە هەمویان ئەرکێکی گەورە پێك دێنن.

## ئەو ئەدیب‌و نووسەرانەی لە خزمەتی فیکری خۆرئاوادا بوون

(ئەنتۆنی ماسترز) ل کتێبەکەیدا (الادباء العملاء )دا دەڵێ:

لەپێش‌و لەنێوان هەردوو جەنگە جیهانیەکان‌و لە کۆتایشیان دا کۆمەڵێکی زۆر لە ئەدیب‌و رۆمان نووسان، بۆ دەزگای ئیستخباراتی بەریتانیا کاریان کردووە، زۆریش لەو نووسەرانە ئەندامی پایە بەرزی ئەم دەزگایانە بووینە لەوانەش ( جۆن بۆکان، سۆمرست مۆم، ئەیان فلمنگ، مالکوم مکردج)..

(لن دیتۆن) کە نووسەرێکە، لەم بارەیەوە دەڵێت: دەزگای ئەمنی بەریتانیا بوو بوە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ ناوەرۆکی زۆرێك لە شانۆگەری و فیلم‌و چیرۆك و ڕۆمانەکان بۆ ساڵانێکی زۆر .. زۆریش لە نووسەرە میللیەکان لەو کەسانە بوون کە لە بواری دیبلۆماسی(السلك الدبلوماسی) کاریان کردوە ،وەك (جۆن نانس، ستیڤن هارتۆف، رۆبرت لورنس) هەروەها رۆماننووسی ئەمریکی (هاوارد هنت) زیاتر لە (٤٠ رۆمان)ی بەناوی خوازراوەوە بۆ خزمەتی سیاسەتی ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکی نووسیووە، هەندێك لەو رۆماننووسانە پێش بینی گرنگی رووداوەکانیان کردووە، بۆنموونە ئەوکاتەی(بۆل ئەردمان) رۆمانی (روخانی ساڵی ٧٩)ی نووسی

کاردانەوەیـــەکی سەرســوڕهێنەری پەیــداکرد، لەبەرئـــەوەی باســی (هێرشی ئێرانی بۆ سەر کێڵگە نەوتیەکانی عێڕاقو سعودیەو کەنداو کرد، ئەمەش وەکو پێشبینیەك بوو بۆ شەڕی کەنـداو، کـە زۆر لـە رووداوەکـانی نـاو رۆمانەکـە لـە رووداوەکـانی هـەردوو شـەڕەکانی کەنداو(ئێرانو عێڕاقو داگیرکردنی کوێت) دەچوون...

هەروەها رۆمـانی ((هەینی غـەمناك ـ الجمعـه الحزینـه-) ی رۆبـرت لۆرنس هۆڵت) لەم بابەتە بوو، بەجۆرێك گەر بێت وشـەی ( ئێـرانو ئێرانیـەکان) بگـۆڕین بـە (عێـڕاقو عێڕاقیـەکان) ئـەوە یەکـسەر روداوەکـانی نـاو رۆمانەکـە دەبنـە ئـەو رووداوە راسـتەقینانەی کـە لە(دووی ئابی ساڵی ١٩٩٠ز ) لەنێوان عێڕاقو کوێت روویاندا.

هـەروەها هەنـدێ لـە توێـژەران لـەم بڕوایـەدان کـەوا نووسـەری گـەورەی ئینگلیـز (ولـیم شکـسبیر) پەیوەنـدی بـە ئیـستخباراتی بەریتانیا هەبووە، لەپاشاندا هەر ئەمەش بووە هۆی کوژرانی.

## ئەدیبو نووسەرانی کورد لەخزمەت فیکری نەتەوایەتی دا

گـەر چـاوێك بـە رسـەربوردەو بەرهـەمی شـاعیرانی دێرینمـان دا بخشێنین بۆمان دەردەکەوێ کە شاعیرانمان بەبێ ئەوەی بکەونـە ژێـر کاریگـــەری بیروبۆچـــوونی دەســـەڵاتداران.. هـــەر لەخۆیانـــەوە، رووداوەکـانو گۆڕانکاریـیـەکانی دەورووبـەریان کـاری تـێ کـردوون و، بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی پاداشتی میرو بەگلەر بن، بـەپێی تێڕوانینـی

خۆیان بۆ مەسەلەکان شیعرو وتاریان وتووە.. ئەگەرچیش زۆربەی شاعیرانمان ..(دەڵێم شاعیرانمان چونکە کۆنترین رەگەزی ئەدەبیمان شیعر بووەو، ئەدیبانیشمان زۆریان سەرەتا بە شیعر دەستیان پێ کردووەو دواتر رێچکەیەکی ئەدەبیان بۆ خۆیان دەستنیشان کردووە، ئەوجا زۆربەی شاعیرانمان لە گۆڕەپانی رووداوەکان نزیك بووینەو توانیویانە بە شیعرە جوانەکانیان و بە جوانترین شێوە رووداوەکانی سەردەمی خۆیان تۆمار بکەن.

هەر لەبەر ئەوەش بووە کە دەسەڵاتدارو سەرکردەکانمان هەریەکە ویستوویەتی، شاعیرێکی کارامەی لە تەك بێتو تا رووداوەکانی بە ئەمانەتەوە تۆمار بکات، هەر لەبەر ئەوەش بووە کە زۆربەی دەسەڵاتدارانو میرەکان دەبوا شاعیرێك یا گۆیندەیەك شەوانی دیوەخانەی برازاندایەوەو... هەر لەبەر ئەوەش بووە کە( شوکری فەزلی و کاکەحەمەی ناری و عەلی کەمال باپیراغای کەماڵی) هاودەمی شێخ مەحموودی حەفید بوینەو(وەفایی) هاودەمی شێخ عوبەیدوڵای نەهری بووەو، شاعیرانی وەك (هێمنو قانیعو هێدی)، هاودەمی قازی محەممەدی پێشەواو و کۆماری مەهاباد بووینە و، ( هەژاری موکریان)یش بەردەوام دۆست و نزیکی مستەفا بارزانی بووە، هەر بۆیەش بووە کە لەناو چەندین رۆشنبیرو فێرکەراندا بنەماڵەی بەردخانیەکان (حاجی قادری کۆیی)یان لە ئەستەنبۆڵ بۆ فێرکردنی منداڵەکانیان دەست نیشان کرد.

برەوپێدانی بیری نەتەوەیی کورد ئەوەندەی بە هۆی شیعری شاعیرە نەتەوەییەکانمان لەسەر زاری خەڵکی دانو، ئەوندەی رۆژانە

ئـەم شـیعرە نەتەوەییانــە لـە قوتابخانــەکانو باخـچەکانی گەشـتو گــوزارو ئاهــەنگو ڤیــستیڤاڵەکان دووبــارە دەبنــەوەو بــە ئــاواز دەیلێنــەوە، ئەوەنـدە نـاوو نازنـاوی سـەرکردە نەتەوەییـەکان دەکـار نایێ٠

ئەحمەدی خانێ (١٦٥٠ز-١٧٠٦ز) تـوانی راسـت گۆیانـە بیربۆچوونو ئازاری نەتەوەکەی لـە سـەردەمی خـۆی تۆمـار بکاتو،دەردو سـتەم و دوژمنە گەورەکانی ئەوسای کورد دەستنیشان بکات. کە رۆمو عەجەم بووینەو هەر رۆژە کوردیان بە دەردێك بـردووە و، ئـەم هەڵوێـستەی (خـانی) بووەتـە سەرمەشـقێك بـۆ شـیعری نەتەوایـەتی لای زۆربـەی شاعیرانی کوردو تەواوی کورد..

هـەروەها (سـالمی سـاحێب قـڕان) بـە چامەیەکی درێـژوو پـڕ سـۆز لەسـەر شـەڕی نێـوان عوسمـانلی و کـوردە بابانــەکان سـۆزێکی پـڕ جۆششی نەتەوایەتی کورد دەنوێنێ..

(حاجی قادری کۆیی) بە پێشڕەوی کاروانی بیری نەتەوایەتی کورد دەژمـێردرێ، کـە تـوانی گەشـە بـە خـەباتو تیکۆشـانی کـورد بـداتو ڕیچگەی سەرکەوتنیان بۆ فەراهەم بکات..

(حـاجی) زیـاتر لـە هـەر سیاسـەتمەدارێك تـوانی دەردی کوشـندەی نەتەوەکــەی (کــە دوژمنایــەتی و یەکنــەگرتنی دەســتەو چــینو ســەرپاکی ڕۆڵــەکانی گەلەکەیــەتی) دەســت نیــشان بکــات، هــەردەم شیعرەکانی چرای ڕێگا روونکـەرەوەی نەتـەوەی کـورد بووینـە، کـورد چـەندین شـاعیری لێهـاتووی دیکـەی ئـەوبوارەی هـەبووەو، هەیـە کـە

توانیویانــە بــۆ چــەندین ســەدە بــرەو بــە بیروبۆچــوونی نەتەوایــەتی گەلەکەیان بدەن.

## ئەو نووسەرو شاعیرانەی گیانیان لە پێناو گەشە پێدانی هزردا بەخت کرد

(٭ تورفەی کوڕی ئەلعەبدی شاعیر:کە والی بەحرێن ( لەسەر داوای دەسەڵاتداری عێراق عەمرو کوڕی هند) پێش هاتنی ئیسلام کوشتی.

٭ ئەعشای هەمەدانی شــاعیر:ئەلحــەجاجی کــوڕی یوســفی ســەقەفی لە کوفە کوشتی.

٭ ئەلکــەمیت کــوڕی زەیــدی ئەســەدی شــاعیر:والی عێــڕاق یوســفی کوڕی عەمری سەقەفی لە کوفە کوشتی.

٭ ســودەیف کــوڕی مــەیمونی شــاعیر:ئــەبو جەعفــەی مەنــصور لــە بەغدا کوشتی.

٭ بەشاری کوڕی بوردی شاعیر:ئەلمەهدی خەلیفــە بــە تۆمــەتی بــێ بڕوایی کوشتی.

٭ ئــــەبو نەخیلــــەی شــــاعیر عیــــسی کــــوڕی موســــای یــــەکێ لــــە سەرکردەکانی مەنسور کوشتی .

٭ ئــــیبن ڕۆمــــی شــــاعیر: ئەلقاســــم کــــوڕی عەبــــدوڵڵای وەزیــــری عەباسیەکان ژەهر خواردی کرد.

٭ (ساڵح کوڕی عەبدولقدوس)ی شاعیر هاڕونە رەشید لەناوی برد.

٭ دوعبولی خوزاعی شاعیر:یەکێ لە خەلیفەکانی عەباسی بە ژەهر کوشتی٠.

★ عەلی کوڕی جبلەی شاعیر: خەلیفە مەئمون لەناوی برد.

★ ئەلحەلاج: ئەلموقتەدیری خەلیفە کوشتی.

★ ئەبو یەنبەغی شاعیر: واسیقی خەلیفە کوشتی.

★ فەزڵ کوڕی سەهلی شاعیر.. موئمون کوشتی.

★ محەممەد کوڕی عەبدولمەلیکی زەیانی شاعیر.. متوەکیلی خەلیفە لەناوی برد.

★ ئەلموتەنەبی شاعیر.. بە هەر بیانوویەك چەند ڕێگرێك کوشتیان.) [٧٢]

ئەم شاعیرانە پێش لەناوبردنیان بە شیعرەکانیان رۆڵێکی کاریگەریان لە ژیانی رۆژانە عەرەباندا هەبوو و، هەر شاعیرێك شیعرەکانی لەپێناوی بیروبۆچوونە تایبەتیەکانی بوو، کە لە پشتەوەی شیعرەکانی دا حەشاری دابوون.. هەرکاتێك ئەم پەردە لەسەر ئەم حەشارگەیە والابوو، دەبووە هۆی لەدەستدانی گیانی و، دەبوە قۆچی قوربانی شیعرە هەڵوێستدارەکانی..

هەروەها پێش ئەم مێژووەش (سوقرات ٤٦٩ – ٣٩٩ پ. ز )ی فەیلەسووفو نووسەروو وتاربێژ ژەهر خواردکرا و لەپێناوی نووسینو وتارەکانی گیانی لەدەست دا.

هەروەها (لۆرد بایرۆن-١٧٨٨ز-١٨٢٤)ی شاعیری ئینگلیزی لە شەڕێکی بەرگری و بۆ گێرانەوەی ئازادی بۆ یۆنان گیانی لەدەست دا ئەوکاتەی یۆنانیە مەسیحیەکان لە جەنگی بەردەوام دابوون لەگەڵ تورکە موسڵمانەکان... (بایرۆن) لەپێناوی سەرخستنی بیری مەسیحییەت گیانی لەدەست دا.

هەروەها (برتۆ جیوراندو ١٨٤٨-١٩٠٠ز) زاناو ئەدیبی ئیتاڵیا کە بۆچوونی ئاینی سۆفیگەری هەبوو و، لەسەر(وحدە الوجود) بونیاد نرابوو، لەسەر ئەمە دادگا پشکێنەرەکان (محاکم التفتیش) گرتیانو پاشان سوتاندیان..

★ ئەلسکەندەر پۆشکین (١٧٩٩ز-١٨٣٧ز) شاعیری گەورەی روسیا لە بەرگری بۆچوونەکانی لە شەڕە شمشێر(مبارزە)یەك گیانی لەدەست دا هەروەها (فریدریکۆ گارسیا لورکا(١٨٩٩-١٩٣٦ز) کە شاعیرێکی گەورەو شانۆ نووسێکی گەورەی ئیسپانیابوو لەسەر هەڵگرتنی بۆچوونە تایبەتیەکانی خۆی لە (ئابی ١٩٣٦ ز ) لە غرناتە لەلایەن کۆمەڵێك لە فاشیزمەکان گیراو پاشان گوللەباران کرا.

★ (سەید قوتبی شەهید) لەسەر کتێبی (المعالم في الطریق) بە دەستی نەیارانی مرۆڤایەتی شەهیدکرا، تاکو ئیمڕۆکەش وشە پڕ سۆزو میهرەکانی لەدڵان ساڵ دوای ساڵ نێرگز ئاسا دەگەشێنەوە.

★ (ناسری سوبحانی) بووە قوربانی نووسینو وتارە بەهێزەکانی.

★ (شاکر فەتاح)ی نووسەرو ئەدیبی گەورە بووە قوربانی بۆچوونە بەنرخو گرانبەهاکانیو، وشە پڕشنگدارەکانی.. دوژمنانی سەرسەختی هەژاند..

★(سەیدا صالح یوسفی) شاعیرو نووسەر کە هەموو شیعرو نووسینەکانی رەنگدانەوەی بیری نەتەوەییەکانی بوو کە نەیتوانی دەستبەرداریان بێت گیانی خۆی کردە قوربانی هەمووان..

زۆری دیکە هەن قەڵەم لە ئاستیاندا کولەو بەو کەمەش دەروون ئاو ناخواتەوەو باسێکی درێژتری گەرەکە.

لەم باسەدا بۆمان دەردەکەوێ کە نووسەرو شاعیر لەخۆیانەوە کانگای شیعرو نووسینیان ناتەقێتەوە، بەڵکو هەر ڕووداوێك لە ڕووداوەکانی کاریان تێ دەکات، بەو مانایەی کە نووسەران و شاعیران، بەتایبەتی شاعیران بە سەلیقەنو هەستیان ناسکەو لە کەسانی دیکە هەستەوەر ترنو ڕووداوەکانیاتر کاریان تێ دەکات ..

وەکو سێوەکەی (نیوتن).. کاتێ خەڵی لەژێر دارێکی بەردار سێوێك یا هەرمێوەیەکی دیکە دەکەوێتە سەر زەویەکەی بەردەمی.. بێ ئەوەی بیر لە هۆی کەوتنە خوارەوەی بکات، قەپێکی لێ دەگرێت.. بەڵام کاتێ (نیوتن) سێوەکەی کەوتە بەر دەمی بۆ ماوەیەکی زۆر لە تێڕامان ، بیری لە هۆی بەربوونەوەی کردەوەو یاسای کێش کردنی لێ کەوتەوە.

جا ئەگەر گۆڕانکاریەکان لای خەڵکی عەوام ئاسایی بن، بەڵام لای نووسەرێك یا شاعیرێك لە مێشکیدا پەنگ دەخواتەوەو تێك دەقژێنو بەرهەمێکی ئەدەبی لێ دەکەوێتەوە..

کەواتە هەر بەرهەمێکی ئەدەبی لە ئەنجامی گۆڕانکاریەکان لەدایك دەبێ و هەر بەرهەمێکی ئەدەبیش بیروبۆچوونێکی تایبەت بە ئەدیبەکەی لە پشتەوەیەو دەی وروژێنێ و، ماوەیەکی دوورودرێژ لە دەروونیدا پەنگ دەخواتەوەو دواتر دەتەقێتەوە..

بەدرێژایی مێژوو ئەدیبان ئامادەی گۆڕانکارییەکانی بوارەکانی ژیان بووینەو خاڵ بە خاڵ دەستپێك و ناواخنو ئەنجامی ڕووداوەکانیان تۆمار کردووە.

لەپێناو ئـەم بیروبۆچوونانەشـیان دا هەنـدێکیان بـەردەوام میـوانی بەندیخانــەکان بوینــەو زۆرێکــیش گیانیــان لەپێناویــدا بەخــشیووە لەکۆتایی دا بۆمان دەردەکەوێت کـە نـەمری بیروبۆچوونەکان بەشـی زۆریان لەبەر پاراستنیان لـەدوو تـوێی کتێبێـك یـا لـەناو چامەیەکی کـورت یـا درێـژ دایـە.. گـەر سـەیری ئـەو داسـتانو فلـیمو زنجـیرە تەمسیلەیە ئایینی و مێژووییانە بکەین کە گوزارشت لە گیانی ئایین یا نەتەوە دەکەن، دەبیـنین چۆن لـەکاتی بینینیانـدا سـەر لـەنوێ لـە دڵاندا چرۆ دەردەکەنو گەش دەبنەوە.. بۆنموونە(زنجیرەی هاوەڵانی ئەشکەوت)و (مەریەمی پیرۆز)و (یوسفی راستگۆ – سەلامی خوای لە سەر)و، فلیمی (پەیام ـ الرسالە)و، فلیمی (عومەر موختـار)و، (یوسـف سەڵاحەدین)و، (خانی لـەپ زێـڕین)و چـەندەهای دیکـە گـەواهین بـۆ ئەم بۆچوونەمان.

---

## پەیوەندی نێوان ئایین و شیعری شاعیرانی کورد

لە مێژووی ئەدەبی ئیسلامیدا دەردەکەوێ کە هەروەکو لە پێشانیشدا باسمان کرد ، هـەر لەگـەڵ سـەرهەڵدانی ئیـسلامەتیدا وەکـو ئـاینێکی نـوێ و یەکـەم ململانێی خواناسان و بتپەرستان ئـەمیش سـەری هەڵـدا ، بـەلام ئەمـەش وا نەبێ کە عارەبەکان هەتا هەتایە شۆڕەسواری ئـەم مەیدانـە بـوو بـن ، بـەڵکو لـە هەرشـوێنێك و لـەناو هـەر نەتەوەیـەك ، ئـەم ئاییـنـە خێـرابلاّوە سـەری هەڵـدابێ ، ئــەوە ئــەدەب و هونــەر بــە گـشتی و شـیعر بــە تایبــەتی وەکـو هۆکارێکی کاریگەری سەرکەوتن و خێرا بلاّو بوونەوەی ئامادەی کۆڕەپانەکـە

بـووه و، بـه جـوانی گوزارشـتی لـه خۆشەویـستی هـەڵگرانی ئـەم ئایینـه بەرامبـەر ئایینەکـەیان کـردووه ،یـەکێ لـەو نەتـەوه زیندوانـەش نەتـەوەی کـوردە کـه لەگـەڵ ناسـینی ئـەم ئاینـەپیرۆزە هـەموو هۆکـارێکی بـۆ بـەرز راگرتنی بەکارهێناوە ، یەکێ لـەم هۆکـارە گرنگانـەش (شـیعر) بـووه ، شـیعر وەکو ڕەگەزێکی کۆنی ئەدەبی لە نـاو کوردانـدا ، ئـەم رۆڵـەی بـۆ ناسـاندن و نیشاندانی ئاکارە جوانـەکانی ئاینەکـەی و بـەرز راگرتنـی بۆنـه ئایینییـەکان بینیووه.

شـیعری سـۆفیگەری و عیرفـانیش لـه پێـشەوەی هـەموو جۆرەکـانی دیکەی شیعر بوونە...دیارە کە بۆ یەکەمجار (بابـا تـاهیری هەمـەدانی (٩٣٥-١٠١٠ز) بەیەکەم شاعیری دیوان دیاری کورد دەزانین ئەوە لـەڕێی تەسەوف و وێنە جوانـەکانی سروشـتی کوردسـتانەوە هەسـتی قـووڵی خۆ بەکورد زانینـی ئـەو کەسـه دەبیـنین کـەلای وابـووه بـه کـەرامات فێری عەرەبی بووەو ووتویەتی (أمسیت کردیاً وأصبحت – لـه صباح – ه وە عربیاً – ئێوارە بەکوردی دەدوام و بەیانی قسەم بـه عـەرەبی دەکـرد) (٧٣)، بـەلاّم مـن پـێم وایـه کـه (بابـا تـاهیر ) لـه خۆشەویـستی ئاینەکـەیی و زیـاتر ناسـین و خـۆ لێ نزیـك کردنـەوەی ، هـەولی خـۆ فێرکردنی زمانی عەرەبی داوە، تـاکو بزانـێ شاعیرانی عـەرەب چۆن سـەیری ئیـسلامیان کـردووه کـه لـەناو ئەوانـەوە بـۆ سـەرجەم مرۆڤایەتی نێرراوە.

شـتێکی ئاشـکرایه کـه زۆربـەی شـاعیرانی دێرینـی نەتەوەکـەمان بەهۆی وەرگرتنی زانیارییه سەردەمەکانیان له ژووری مزگەوتەکانی کوردسـتان و دەورووبـەریان فێـری زمـانی عـەرەبی بووینـەو

هەندێکیشیان ،وەکو مامۆستایەکی سەرکەوتوو لە وڵاتان ناوی دەرکردووە ...بە هۆی زانینی زمانی عەرەبی چوونەتە قوڵایی شیعری عەرەبی و لەگەل خوێندنەئایینیەکانیشدا (زانستی عەرووزی فەراهیدی) یان خوێندووە.. شیعریان پێ هۆنیوەتەوەو بەناو دیوانی شاعیرانی عەرەبیشدا گەڕاون..زیاتر بەم شیعرانە سەرسام بوونە کە باسیان لە گەورەیی پێغەمبەر (ﷺ) کردووە وەکو شیعرەکانی (حەسانی کوڕی سابیت و کەعبی کوڕی زوهەیر و دواتر بایەزیدی بوستامیو ، پاشانیش مەولانا جەلالەدینو محیدین ئیبنو عەرەبی.. هەروەها قەسیدەی بووردەی ( کەعبی کوڕی زوهەیر ) کاری زۆری تێکردوون و زۆربەی شاعیرانی دێرینی کورد هەوڵیان داوە لەم بوارە لاسایی دانەری ئەم قەسیدە جوانە بکەنەوە... شیعرە نایابەکانی هەندێ لە شاعیرانی سۆفی و عیرفانی هیچیان لە شیعری ئەوان کەمتر نییە ، بەڵکو من وەکو کوردێك زیاتر چێژلە شیعری شاعیرانی خۆمانە وەردەگرم و لام وایە لەم رووەوە کەم شیعری شاعیرانی نەتەوەکانی دیکە دەگەنە شیعری (محوی ١٨٣١ز_ ١٩٠٦ز)، بەتایبەتی قەسیدەی بەحری نوورەکەی و قەسیدەی (ئەی ساکینی ریازی..نالی ١٧٩٧ز – ١٨٥٥ز) و قەسیدەی (شمس الهدی ی وەفایی ١٨٤٤ز -١٩١٤ز) و هەروەها قەسیدەکانی (ئەحمەدی خانی و حاجی قدری کۆیی و حەریق و خادیم و مەولەوی و بیخود و حەمدی و سافی و پیرەمێرد ونـاری و ...) وچەندانی دیکە کە لێرە شوێنی هەموان نابێتەوە .

شاعیرانی کورد بەردەوام ویستوویانە بۆ هەموو نەتەوەکانی دیکە بسەلمێنن کە لەرووی نەزم و هونەری شیعری و خۆشەویستیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و ئاینی ئیسلام ، هیچیان لە شاعیرانی نەتەوەکانی دیکە کەمتر نییەو بەڵکو بە گوڕو تینترو دڵسۆز ترن .

ئەم پەیوەندییەو خۆشەویستییەی نێوان هەردوولا - ئاین و ئەدیبانی کورد –لە سەدەکانی رابووردووەوە تاکو ئێستاش هەر بەردەوام بووە، بەلام دیارە کە نووسەرو شاعیرانمان ، هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بە گوڕوتینێکی نوێوە بە شیعرو پەخشان و نووسینەوە ئایینەکەی خۆیان گوڵ باران کردووە ...

ئەم ئەدیب و نوسەرانەشمان کە زۆربەیان بە توانای تاکەکەسی و هەریەك لە کونج وسەنتەری خۆیەوە خزمەتی بە ئەدەبی ئیسلامیی دەکرد بەردەوام هەوڵیانداوە کە لە بلاْوکراوە کوردییەکاندا شوێنی بەرهەمەکانیان بکەنەوە ...تا ئەو کاتەی رێیان پێدراوە بەرهەمە ئیسلام ئامێزەکانیان لە بلاْوکراوە رۆشنبیریەکاندا بلاْوبکەنەوە ، نووسەرو شاعیرانی ئیسلامی گرفتێکی ئەوتۆی بلاْو کرنەوەیان نەبووە ...

بەلاْم دواتر هەندێ لە ناوەندەکانی رۆشنبیری زۆربەی بلاْوکراوەکانی خۆیان بۆ بابەتی تایبەت بە سیاسەتی خۆیان یەکلاکردەوە بابەتی ئیسلامیی وەکو پێویست بلاْو نەدەکرایەوە ،بۆیە نووسەرانی ئیسلامیی بیریان لە دەرکردنی بلاْوکراوەی تایبەت بەخۆیان کردەوە ..هەر ئەوە بوو کە لە ساڵی(١٩٨٤ز)لە شارۆچکەی پاوەی ئێران چەند نووسەرێکی ئیسلامی مامۆستایان ( سەلاحەددین

محمد بەهائەددین و عومەر عەبدولعەزیز و ئەحمەد بەیاتی ) بۆ پەیدا کردنی مینبەرێ بۆ بلاْوکردنەوەی باتبەتەکانیان گۆڤاری(نداء الغریب - دەنگی ئاوارە) یان دەرکردو ،ئەم گۆڤارە کە مۆرکێکی ئیسلامی کوردەواریانەی بە خۆوە گرتبوو ، تاکو ساڵی (١٩٨٧ز) بەردەوام بوو و حەوت ژمارەی لێدەرچوو..دەکرێ ئەم گۆڤارە بە یەکەم گۆڤاری سەردەمی نوێی تایبەت بە کاروباری ئیسلامی و ئەدەبی ئیسلامی دابنرێت.[٧٤].

هەر دواتر لە کۆتایی ساڵانی هەشتا کان بۆ هەمان مەبەست کۆمەڵێ لە نووسەرو ئەدیبانی موسڵمانی کوردی ئاوارە ، لە کوردستانی ئێران گۆڤاری (گزنگ) یان دەرکرد....

## بیرۆکەی کۆمکاری ئەدەبی ئیسلامیی لە کوردستاندا

بیرۆکەی کارکردنی بەکۆمەل و دەستەجەمعی بەردەوام لە مێشکی هەندێ لە نووسەرانی کوردی خەمخۆری ئەدەبی ئیسلامی دەخولایەوەو .. ئەوانە پێیان وابوو بۆ زیاتر کارا کردنی کاروباری نووسین لە پێناو و خۆشەویستی ئاینەکەیان گەر لە چوارچێوەی رێکخراوێك یان کۆمەڵەیەك بن باشترەو و کارەکان تۆکمەترو دیکۆمینتر دەبن ، بۆیە هەر لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکانەوە کەوتنە هەوڵی بەردەوام بۆ یەکتر ناسین و بەیەك گەیشتن و کۆبونەوەی ئەدیب و نووسەران ...ئەوەبوو هەر وەکو مامۆستا (حەسەن پێنجوینی) نووسەر لە دیمانەیەکی لەگەڵ گۆڤاری پەیامی راستی (ژ/٦٦ ساڵی ٢٠٠٢ز) ئاماژە بەوە دەکات (کە ساڵی ١٩٧٨ز بۆ

**یەکـەمجار مامۆسـتا (سـەلاحەددین محمـد بەهائـەددین) بیرۆکـەی ئەوەی خستە روو ،کە یـەکێتی نووسـەرانی ئیـسلامیی لـە کوردسـتان هـەبێت) [٧٥] ، ئـەم یەکێتیـەش پێـك هـاتبوو لـە چـەند نووسـەرێکی دیکەش کـە دواتـر هەریەکـە رۆڵـی دیـاری خـۆی لـە پانتـایی ئـەدەبی ئیسلامیدا بوو...**

**هـەروەها سـەبارەت بـە بیرۆکـەی بـوونی کۆمەڵەیـەك کـە سـەرجەم ئـەدیب و نووسـەرانی ئیـسلامیی لـە کوردسـتان لـە خـۆ بگرێـت، لـەم بارەوە بەڕێز (مامۆستا هادی عەلی) لە دیمانەیـەکی تایبەتـدا لەگـەڵ گۆڤاری (پەیامی راستی – ژ/٦٧ساڵی ٢٠٠٢ز) دا روونتر و بەر فراوانتر بـاس لـە قۆناغـەکانی یـەکگرتنی ئـەدیب و نووسـەرانی ئیـسلامی لـە کوردسـتاندا دەکـات و دەڵـی : (دەتـوانم بڵـێم کـە بیرۆکـەی کۆمەڵـەی نوسەران بە سێ قۆناغدا تێپەڕی....**

**قۆناغی یەکەم :لە ساڵی ١٩٧٨ز دەستی پێکردووە ، وەکو لێژنەیـەکی نوسەران و ئەدیبان لە لایەن چەند نوسەرێکی ئیسلامییەوە پێکهات ،لەوانە مامۆستایان (سەلاحەددین محمد بەهائـەددین ، هـادی عـەلی ، محـسن جـوامێر ، حەسـەن پێنجـوینی ، جوتیـاری شـاعیر ، کریکـار، حەبیب محمد سەعید ، محمد روشدی) بـوون...و یەکـەم دانیـشتنیان لە هەولێر لە ماڵی محسن جوامێر بوو.....**

**قۆنـاغی دووەم : لـە (سـاڵی ١٩٩٠ز) لـە کوردسـتانی ئێـران دەسـتی پێکـردەوە ..دەسـتەیەکی دیکـە بـۆ بـەرێوە بردنـی کـارو بـاری نووسـەرانی ئیـسلامیی دانـرا کـە مامۆسـتایان (سـەلاحەددین محمـد بەهائـەددین ، هـادی عـەلی ،زوهێـر خۆشـناو ، جـەمال بێـدار ، سـالم**

ئەلحاج ،) بەرێوەیان دەبردو ..ناوی کۆمەڵەکەشیان ناونا (کۆمەڵەی نووسەران و ئەدیبانی موسڵمانی کورد)...

لەو قۆناغەدا له شارۆچکەی (پاوە) بۆ تاوتوێ کردنی کاروباری ئەم کۆمەڵەیە کۆبوونەوەیەکی بەرفراوان بەسترا کە جگە لەو ناوانەی پێشتر باسمان کردن ئەم مامۆستایانەش تیایدا بەشدار بوون (مەولود باوەمراد ، ئیکرام کەریم ، موسەننا ئەمین ) و چەند نوسەرێکی دیکە کە لەم ساتەوەختە نایێنەوە یاد..لەم کۆبوونەوەیە بڕیار درا گۆڤارێکی ئەدەبی بە ناوی (گزنگ) دەربکرێت ، کە لە کۆمەڵگاکانی نزیك شارۆچکەی (جوانڕۆ) مامۆستایان (ئیکرام کەریم و موسەننا ئەمین و چەند برایەکی دیکە) دەریان دەکرد.....

قۆناغە سێیەم: دوای راپەڕین و لە (شوباتی ساڵی ۱۹۹۲ز) لە سلێمانی .. بە سەرپەرشتی (م. سەلاحەددین محمد بەهائەددین) و ئامادە بوونی زیاتر لە (۳۰ نوسەر) دەست بەکارەکانی یەکەم کۆنگرەی یەکخستنی نوسەرانی ئیسلامیی کرا و تیایدا بریاری دامەزراندنی (کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامیی کوردستان) درا و هەر لەم کۆنگرەیەش بڕیاری دەرکردنی گۆڤارێك بە ناوی (پەیامی راستی) وەکو زمانحاڵی کۆمەڵە درا ..ئەم گۆڤارە تاکو ئێستاش بە شێوەیەکی وەرزی دەردەچێت) [٧٦]...

هەروەها مامۆستا(عومەر عەبدولعەزیز) وەك لە تۆماری بیرەوەریەکانی خۆیدا هاتووەو (سوپاسی دەکەم کە بەشێکی لەم بیرەوەریانەی دەستکەوتاندم) سەبارەت بە سەرهەڵدانی ئەم بیرۆکەیە دەڵێ ( لە مێژبوو بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمەڵەیەك کە

گرنگی بدا به ئەدەبی ئیسلامیی خولیای زۆرێکمان بوو ، لە کۆتایی هەفتاکاندا بە هیممەتی مامۆستایان (سەلاحەددین محمد بەهائەددین و محسن جوامێر و حەسەن پێنجوینی و عوسمان جوتیار و چەند کەسێکی دیکە ) گەلاڵەیەکی بۆ کراو ، نیمچە رێکخراوێکی رانەگەیەنراو دەستبەکار بوو و چەندکۆبوونەوەیەکیشمان کرد..مامۆستا ( سەلاحەددین محمد بەهائەددین) کەوتە کۆکردنەوەی شیعرە عیرفانی و ئیمانییەکانی شاعیرە ناودارەکانی کوردی وەك( مەحوی و نالی و بیخود و حاجی قادرو...هتد..)تۆمارێکی بەناوی ( کەشکۆڵی ئەدەبی ئیسلامیی کوردی ) لا گەلاڵە بوو و مامۆستایانی دیکەش لەم رووەوە گرنگییەکی باشیان بەم ئەدەبەدا کە دواتر ئەو دەیان بەرهەمە ئیسلامییەی لێکەوتەوە کە نەوەی رابوونی ئیسلامی لە سالآنی حەفتاو هەشتاکاندا پێی بەهرەمەند بوون..).

## کۆمەڵەی نوسەرانی ئیسلامیی دوای راپەڕین

هەر لەم بارەوە (م. عومەر عەبدولعەزیز) دەڵێ : (راستەوخۆ دوای راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ز کەوتینە خۆ بۆ گەشەدان بەم بوارە و دەیان کۆبوونەوەمان لە شاری سلێمانی ساز کرد، سەرەنجام بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمەڵەیەك کە گرنگی بدات بە ئەدەب و نووسینی ئیسلامیی لە لامان گەلاڵە بوو ، تا لە رۆژی (٦ ، ٧، ١٩٩٢/٢/٨ز )بە ئامادەبوونی ( ٤٠ ئەدیب و نوسەر ) یەکەم کۆنگرەمان لە سلێمانی بەست و (کۆمەڵەی نوسەروئەدیبانی موسڵمانی کورد) ی لێکەوتەوە

و تیایدا بڕیار له سەر پەیرەوێکی ناوخۆی کۆمەڵەکە درا ، سەرەتا لە سلێمانی و هەولێر لقی خۆی کردەوەو دواتر لە دهۆك و هەڵەبجەی شەهید و دەربەندیخان و رانیە و هەڵەبجەی تازەش لقەکانی خۆی کردەوە..دواتر لە سەرجەم شارو شارۆچکەکان چالاکییەکانی خۆی ئەنجام دا و چەند چالاکییەکی لە هۆڵە جەماوەریەکان ساز کردو بۆ بۆنە ئایینیەکانیش لە مزگەوتەکاندا ئاهەنگەکانی ( مەولود و کۆچ و میعراجی پێغەمبەرمان (ﷺ) ) گێڕا ) شایانی وتنە ئەم کۆنگرەیە بە سەرپەرشتی مامۆستایان ((سەلاحەددین محمد بەهائەددین و هادی عەلی و عومەر عەبدولعەزیز و فاروق رەسوڵ ) و چەند کەسێکی دیکە گرێدرا..و لەم گۆنگرەیەدا و لەم خولەدا کەسێك وەکو سەرۆکی کۆمەڵە نەبوو..

## كرنگرەی دووەمی کۆمەڵەی نوسەران

لە رۆژانی ١٩٩٣/٤/٧,٨ز یە ئامادەبوونی ٤٠ ئەندامی دامەزرێنەرو بەرپرسی لقەکانی کۆمەڵەو (١٠میوان) نوسەرانی ئیسلامی کۆنگرەی دووەمی خۆیان ساز کرد ، لەم کۆنگرەیەدا دوای پێداچونەوە بە پەیرەوو پرۆکرامی ناوخۆ بۆ گۆرینی ناوی پێشووی ئەم کۆمەڵەیە لە ناو (شەش ) ناوی پێشنیار کراو ، بە تێکڕای دەنگ بڕیار لەسەر ناوی( کۆمەڵەی نوسەرانی ئیسلامی کوردستان ) درا..و لەم کۆنگرەیەدا (م. عوسمان جوتیار) بووە بەرپرسی لێژنەی بالای کارگێڕی (م. هادی عەلی )بووە جێگری بەرپرسی لێژنەی بالای کارگێڕی و (م.عومەر عەبدولعەزیز) یش بووە سکرتێری گشتی کۆمەڵە ..ستاڤێکیش لەم بەرێزانەی خوارەوە بۆ بەرێوەبردنی

مەڵبەندی گشتی کۆمەڵە دیاری کرا: (مولود باوەمراد /بەڕێوەبەری مەڵبەندی گشتی و سەلاحەددین بابەکر/ بەرپرسی پەیەوەندییەکان و ئیبراهیم ساڵح / سکرتێری مەڵبەندو خەزنەدار )..هەروەها سێ لێژنەی سەرەکیش لەم بەڕێزانەی خوارەوە دانران (مولود باوەمراد/ سەرۆکی لێژنەی ئەدەب و حەمە کەریم عەبدوللا/سەرۆکی لێژنەی نوسین و وەرگێڕان و بەکر حەمە سددیق / سەرۆکی لێژنەی هونەر )...شایانی گوتنە کەدوای ئەم کۆنگرەیە لێژنەی خوشکان دەشتیان بە چالاکییەکانی خۆیان کرد..

## کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵەی نوسەرانی کوردستان

لە بەرواری ١٩٩٥/١/١٢ز کۆمەڵە لە ژێر دروشمی (لە پێناو دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێدا)بە ئامادەبەونی زیاتر لە (٥٠ ئەدیب و نوسەر) کۆنگرەی سێیەمی خۆی ساز کرد....

لەم کۆنگرەیەدا هەندێ گۆڕانکاری ئەنجامدران..لەوانە:

(م.جوتیار)وازنامەی خۆی راگەیاند و (م. جمال حبیب الله بێدار) کرا بە سەرۆکی کۆ مەڵە...و بەشی هونەری لە بەشەکانی کۆمەڵە جیا کرایەوە ..و نوسینگەی گۆڤاری ( پەیامی راستی) یش لە مەڵبەندی گشتی کۆمەڵە جیا کرایەوە ..

## کۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵەی نوسەرانی کوردستان

لە بەرواری ١٩٩٧/٦/٢,١ز بە ئامادەبوونی زیاتر لە ( ٥٠ ئەدیب و نوسەر) لە ژێر دروشمی ( بەرەو بە جەماوەری کردنی ئەدەب و رۆشنبیری ) ، کۆنگرەی چوارەمی خۆی بەست ..لە کۆنگرەیەدا.. بەرێزان ( جلال الدین نجم الدین و موسەننا ئەمین و علی سالح

میران) بۆ دەستەی باڵای کۆمەڵە هەڵبـژێردران و لـە ناویانـدا بـەڕێز (سالم الحاج ) بە سەرۆکی کۆمەڵە هەڵبژێردرا..

## کۆنگرەی پێنجەمی کۆمەڵەی نوسەرانی کوردستان

لە بەرواری ٢٠٠٠/٥/١ کۆمەڵەی نوسەرانی کوردستان لە ژێر دروشمـی (هـەموو خەمـەکان لـە پێنـاو بەخـشینی واتایـەکی نـوێ بـە ژیـان ) کۆنگرەی پێنجەمی خۆی گرێدا ..و لەم کۆنگرەیەدا بـەرێزان (سالم الحاج و عەلی سالح میران و جلال الدین نجم الدین و نەبەز هـەورامی و ئەحمـەد حـسین زاویتـی بـە دەسـتەی بـاڵای کۆمەڵـەی نوسـەرانی ئیسلامیی کوردستان هەڵبژێردران و لە ناویاندا (عەلی سالح مـیران ) بە سەرۆکی نوێی کۆمەڵە هەڵبژێردرا..

## کۆمەڵەی نوسەرانی ئیسلامیی کوردستان پێش کۆنگرەی شەشەم:

کۆمەڵـەی نوسـەرانی ئیـسلامیی کوردسـتان لەگـەل ئـەم هـەموو چالاکیانەی دا ، دیار بوو لـە ئاسـت و ویـست و مەبەسـتی ئەنـدامانی دانەبوو ،زیاتریان دەویست و حـەزیان دەکـرد یـەکگرتووی ئیـسلامی کوردستان وەکو حیزبی سەرپەرشتیار زیاتر بەدەمیەوە بێـت ، بـەبێ ئـەوەی بـزانن کـە حیـزب کـارو خـەمی زۆر گـەوەرەتری لـە کـاری نوسەران هەیە، ئەویش سیاسەتی رۆژانەیە کە لـەم دونیـا جەنجاڵـەدا هـەموو وزەو تواناکـانی بـۆ فەراهـەم کـرا بـوو و ئەوەنـدەی گوتـاری سیاسی گرنك بوو ئەوەندە ئـەدیب و بەرهەمـەکانی بەلایـەوە گـرنگ نەبوون ، هەر لەم کاتانەدا شتێکی سەیر بوو کە هەنـدێ لـە ئـەدیبان

و نوسەران، بەبێ ئەوەی هەوڵ بدەن خۆیان کۆمەڵەکەیان لە سەر پێوە رابگرن .. لە لایەك هەردەم چاویان لە دەستی حیزب بوو..لە لایەکی دیکە دەیانگووت حیزب دەست لە کارو ئیشەکانمان وەردەدا ...ئەمەش لەم کاتەوە بوو کە جگە لە مامۆستا سەلاحەددین محمد بەهائەددین ..هەندێ لە سیاسەتمەدارانی یەکگرتوو ئەم کۆمەڵەیان بە شتێکی زیاد دەزانی ،گرفتێکی دیکەی کۆمەڵەش نەبوونی (مۆلەتی یاسایی) یەکەی بوو ،کە بۆ وەدەست هێنانی ئەم مۆڵەتە چەندین جار سەردانی دەزگای پەیوەندار کرا ، هەمووجار دەیان گووت مافی خۆتانە و دواتر هەوڵەکان شکستیان دەهێنا ..تا دوا جار لە وەزارەتی ناوخۆ لە هەولێر ،پێیان راگەیاندین کە ..مۆڵەتەکەتان موافقەی (لقی هەولێری یەکێتی نوسەرانی کورد)ی دەوێ ..دوای چەند دیدارێك لەگەڵ بەڕێز (مەهدی خۆشناو) سەرۆکی لقی هەولێر (خوای گەورە بە بە هەشتی شاد بکات ) زۆر بەڕێزەوە وەکو دوو نوسەری هاوشاری پێشوازی لێ دەکردین ، بەلاّم دواتر کەباس دەهاتە سەر مۆلەتی کۆمەڵەکەمان ..باسەکەی دەگۆڕی و ئامادە نەبوو گوێ لەم باسە بگرێت... تەنها جارێکیان نەبێ کە بە راشکاوانە گووتی: دەبێ هەموو نوسەرانی کوردستان لە ژێر چەتری (یەکێتی نوسەرانی کورد ) دابن و ئێوەش وزەو توانای باشتان هەیەو لەناو یەکێتی نوسەران خەرجی بکەن ، ئەمە بۆ یەکریزی نوسەرانی کورد قەناعەتی بە ئێمە هێنا ..بەلاّم لە هەمان کاتیش ( یەکێتی نوسەرانی کورد) یش تاکو ئێستا یەك ئەندامی ئێمەی (کۆمەڵەی نوسەرانی ئیسلامیی) نەکردووە بە ئەندامی خۆی..

## کۆنگرەی شەشەمی کۆمەڵەی نوسەرانی کوردستان

لــە رۆژی ٢٠٠٤/٩/٢٣ کۆمەڵــەی نوســەرانی ئیــسلامی کوردســتان کۆنگرەی شەشـەمی خـۆی بەسـت و بـۆ یـەکڕیزی نوسـەرانی کـورد ، تیایـدا لــە جیـاتی لقــەکانی کۆمەڵــە بریـاری کردنــەوەی چــەند سەنتەرێك درا..

گومـانی تێـدا نییـە کـە جگـە لـە کۆمەڵـەی نوسـەرانی ئیـسلامیی کوردستان کۆمەڵەو بزاڤی دیکەش خزمەتی ئەدەبی ئیسلامییان لـەم کوردسـتانە ئـازیزەدا کـردووە ، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی مـن تـەنها لـە کۆمەڵـەی نوسـەرانی ئیـسلامیی کوردسـتانەوە نزیـك بوومـە ، ئـەوە لێکۆڵینەوەی بزاڤەکانی دیکە بۆ لێکۆڵەرانی دیکە جێ دەهێڵم ،

## کۆمەڵەی نوسەرانی ئیسلامی کوردستان و کاروچالاکییەکانی

گەر لە ژمارە سەرەتاییەکانی (گۆڤاری پەیامی راستی ) کە زمانحاڵی کۆمەڵەیە وردبینەوە لە تۆمـاری چالاکییەکاندا ، بۆمـان دەردەکـەوێ کـە کۆمەڵـەی نوسـەرانی ئیـسلامیی کوردسـتان هـەر لەگـەڵ یەکـەم دەست بەکاربوونی نوسەر و ئەدیبانی موسڵمانی لێ کۆ بوونـەوەو لـە هەموو لقەکانی دەستیان بە چالاکی و جموجۆلی ئـەدەبی و هونـەری کــردووە ، بــە زەوق و شــەوقێکی زۆرەوە ئــەدیب و نووســەری ئیـسلامیی تامـەزرۆی بلاوکردنـەوەی بابەتـەکانیان بوونـە ، دەتـوانم

بڵێم هەندێ لە شاعیران بۆ نمونە (م. جوتیار) لە سلێمانی و ، م. صدیق حامد ) لە بادینان ، چەند شاعیرێکی دیکەش لە دەڤەرەکانی دیکەی کوردستان.. لە رووی هۆنینەوەی شیعری بە پێزەوەو ،زۆر لە ئێستا گەرم و گوڕتر بوونە ، بە دڵنیاییەوە دەڵێم ئەم زاتانە و هەندێکی دیکەش گەر خۆیان بۆ کاری ئەدەبی یەکلابکردایەوە ، شاعیرو لێکۆڵەری ئەدەبی تا بڵێی باشتریان لێ دەردەچوو ...بە تایبەتی (م. جوتیار) گەر لە رووی زمان پاراوی و هونەری شیعری و رەوانبێژی سەیری شیعرە سەرەتاییەکانی بکەیت ئەوسا دەزانی چەندە لێهاتوو بووە ..ئەمەش زۆر لە نووسەری دیکە دەگرێتەوە کە ئیمڕۆ لە پانتاییە ئەدەبیەکە بێ دەنگن ...

کۆمەڵەی نوسەرانی ئیسلامیی کوردستان ...هەر لە (شوباتی ١٩٩٢ز) یەوە تاکو (٢٠٠٤/٩/٢٣) کە پێی نایە ساڵی سیانزەهەمەوە و ،کە دوا دانشتنی نوسەرانی ئیسلامیی کوردستان بوو ،پێنج لقی لە شارە گەورەکانی کوردستان کردەوە (لقی هەولێر ، لقی سلێمانی، لقی دهۆك ، لقی هەڵەبجەی شەهید ، لقی گەرمیان) و چەند نوێنەرایەتیەك (رانیە ، سۆران ،) کاریش بۆ ئەوە دەکرا کە لە ئایندە لقی کەرکوکیش بکرێتەوە و داواکاری زۆری لە سەر بوو ..زیاتر لە (١٦٥ ئەندام) ی هەبوو ، کە زۆربەیان ئەندامی کارا بوون ..و بەردەوام بوون لە کارو چالاکییەکانیان ..لەم ماوەیدا (شەش کۆنگرەی) ئاسایی خۆی بەست ، لەگەل زۆرێك لە ئاستەنگ و گرفتەکانادا توانی لە..لە ماوە ئەم سیانزە ساڵەی تەمەنیدا..زۆر بەکورتی دەڵێم کە زیاتر لە (٥٠٠ کۆر) ی ئەدەبی و رۆشنبیری و

وهــزری و زانــستی و (٦٥ خــوولی تایبــەت بــە ئــەدەب و نووســین و وەرگێڕان و رۆژنامەگەری و کومبیوتــەر و بەســەرکردنەوەی زۆربــەی نوسەرو ئەدیبانی کورد و پێشوازی کردنــی زۆرێکیش لــەم ئــەدیب و نووســەرانەو رێزلێنانیــان بــە پێــی توانــا و دامەزرانــدی چــەندین کتێبخانــەی بــاش لــە لقەکانــدا کــە ســودێکی زۆری بــۆ نووســەران هــەبوو..ئەمــەو چــاپکردنی کتێــب و نامیلکــە و هانــدانی چــەندین نووسەرو ئەدیبان ..

پێشکەشکردنی بەرنامەی ئەدەبی لە زۆربــەی رادیــۆو کەنالــەکانی (U.TV) دا و..هــەروەها یادکرنــەوەی یــادە شــکۆدارە ئــایینی و نەتەوەییەکان بۆ نمونــە (کردنــەوەی ڤیــستڤاڵی یــادی ســەلاحەددینی ئــەیوبی) ...و سەرپەرشــتی کردنــی و دەرکردنــی (گۆڤــاری پــەیامی راستی) و (گۆڤاری هەژان ) و (گۆڤــاری جگــەر گۆشــەکان ) و(گۆڤــاری زەنگ و بەنگ) و (پاشکۆی ئەدەب و هونــەری رۆژنامــەی یــەکگرتوو) ..هاوکــاری کردنــی زۆربــەی بڵاوکراوەکــانی دیکــەی شــارەکان بــە بڵاوکردنــەوەی شــیعر و نووســین .. بەشــداری کــردن لــە زۆربــەی چالاکییە رۆشنبیریەکانی شارەکانی کوردستان.

هەنوکــەش زۆرێــك لــە ئــەدیبانمان بــێ دەنگــی گۆڕەپانەکــەن و هەندێکیش کەوتونەتە داوی سیاسەت ، بەڵکو خێرو بێری سیاسەت بیان گرێتەوە،

---

## پەراوێزەکان

١/ قضية  الاسلام والشعر ل١٠ .طبقات فحول الشعراء لابن سلام ج١/ل٢٤

٢/ قضية  الاسلام والشعر ل١٠ . العمدة لابن رشيق ج١/ل٣٠

٣/ قضية  الاسلام والشعر ل١٠. العمدة لابن رشيق ج١/ل١٦

٤/ قضية الاسلام والشعر ل٢٠ .ثلاث رسائل في اعجاز القرآن ل ١٢٥

٥/ قضية الاسلام والشعر ل١٩ .السيرة النبوية القسم الاول ل٢٧٠ ـ ٢٧١

٦/ قضية الاسلام والشعر ل٢٠ . اسباب النزول ل/٢٥٩/....

٧/ قضية الاسلام والشعر ل ٢٢

٨/ قضية الاسلام والشعر ل ٢٩، طبقات فحول الشعراء لابن سلام ج١/٩٩

٩/ قضية الاسلام والشعر ل ٢٩،الشعر والشعراء ج١/٢٠٥

١٠/ قضية الاسلام والشعر ل ٢٩

١١/ قضية الاسلام والشعر ل ٢٩

١٢/ قضية الاسلام والشعر ل ٢٩،اسلام والشعر ل٧١ـ ٧٢/بغداد١٩٦٤

١٣/ قضية الاسلام والشعر ل ٣٠، الشعر والشعراء ج١/٢٠٨

١٤/ قضية الاسلام والشعر ل ٣٠، العقد الفريدج٥/٢٩٤

١٥/ هەمان سەرچا وەی پێشوو و هەمان لاپەڕە

١٦/ قضية الاسلام والشعر ل٣٣

١٧/ قضية الاسلام والشعر ل٣٣

١٨/حسن الصحابةفي شرح اشعارالصحابةل/١٣

١٩/ هەمان سەرچا وەی پێشوو و هەمان لاپەڕە

٢٠/ قضية الاسلام والشعر ل٣٠

٢١/ هەمان سەرچا وەی پێشوو و هەمان لاپەڕە

٢٢/ قضية الاسلام والشعر ل٣٣، البيان و التبين ج١/٢٤١

٢٣/ قضية الاسلام والشعر ل٣٠ ، الشعر والشعراء ج١/٦٨

٢٤/ قضية الاسلام والشعر ل٣٤، الشعر والشعراء ج١/٧٩

٢٥/ قضية الاسلام والشعر ل٣٤، الشعر والشعراء ج١/٧٨

٢٦/ قضية الاسلام والشعر ل٣٥، ، طبقات فحول الشعراء لابن سلام ج٥٦/١
٢٧/ السيرة النبوية لابن هشام/ جـ٢ ل٤٩٧.
٢٨/ هەمان سەرچا وەی پێشوو و هەمان لاپەڕە
٢٩/ قضية الاسلام والشعر ل٣٧، اسلام والشعر ل٣٤
٣٠/ قضية الاسلام والشعر ل٣٧، الشعر الاموي :دراسة في التقاليدو الاصالة الادبيةت٣٧/١٩٧٧م
٣١/ قضية الاسلام والشعر ل٣٧، ومقال بعنوان(بدر والشعر)جريدة الاهرام/١٩٧٧م
٣٢/ العصرالاسلامي ل٤٢ـ ٤٣الطبعة٨دار المعارف المصرية
٣٣/كتابه تاريخ الادب العربي /ل ١٠٢ـ ١٠٣ الطبعة٢٤
٣٤/ قضية الاسلام والشعر ل٣٨، الموازنة بين الشعراء ل ٣١
٣٥/ قضية الاسلام والشعر ل٣٨ ، السيرة النبوية ج ٦٦٠/١
٣٦/ قضية الاسلام والشعر ل٤٠
٣٧/ قضية الاسلام والشعر ل٤٠، طبقات ابن سلام ج ٢٥/١
٣٨/ قضية الاسلام والشعر ل٤٠، الشعرالاموي د.محمد فتوح احمد ل/٣٣ ـ ٣٤
٣٩/ قضية الاسلام والشعر ل ٤١، مقدمة ابن خلدون ل/٦٧٧
٤٠/ هەمان سەرچاوەی پیشوو و هەمان لاپەڕە
٤١/ قضية الاسلام والشعر ل ٤٢، الشعر الاموي ل/٣٥
٤٢/ قضية الاسلام والشعر ل ٤٢، الاسلام والشعر ل/٢٨. ٢٩
٤٣/ قضية الاسلام والشعر ل٤٣، الاسلام والشعر ل/١١
٤٤/ قضية الاسلام والشعر ل٤٤، الاسلام والشعر ل/٣٥-٣٦
٤٥/ قضية الاسلام والشعر ل٤٥ ، الاسلام والشعر ل/٣٧
٤٦/ قضية الاسلام والشعر ل٤٦ ، الاسلام والشعر ل/٣٠
٤٧/ قضية الاسلام والشعر ل٤٨،الموازنة بين الشعراء ل/٣٣
٤٨/ قضية الاسلام والشعر ل٤٨، الموازنة بين الشعراء ل/٤١٩-٤٢٠
٤٩/ قضية الاسلام والشعر ل٤٨،في الشعر الاسلامي والاموي ل/١٣
٥٠/ قضية الاسلام والشعر ل٥١
٥١/ هەمان سەرچاوەی پیشوو و هەمان لاپەڕە
٥٢/محمد حسين ابو الحسن /رەخنەگرورۆژنامەنووسی رۆژنامەی ئەلئەهرام /ژێدەر/ ئینتەرنێت
٥٣/ رحلتي مع الادب الاسلامي/ ل٧٩.

٥٤/ رحلتي مع الادب الاسلامي/ ل٨٢.

٥٥/ رحلتي مع الادب الاسلامي/ ل٨٥.

٥٦/ هەمان سەرچاوەی پیشوو/ل ٨٦

٥٧/ هەمان سەرچاوەی پیشوو/٨٧

٥٨/ الطريق الى الادب الاسلامي/ ل٣٢.

٥٩/ منهج الفن الاسلامي/ ل٧.

٦٠/ مجلة الادب الاسلامي عدد/٨ السنة الثانية(شبهة المصطلح).

٦١/ ملامح العامة لنظرية الادب الاسلامي/ ل٢٥.

٦٢/ الاديب والالتزام/ ل٤٩.

٦٣/ الاديب والالتزام/ ل٥٠.

٦٤/ الاديب والالتزام/٣٩.

٦٥/ الاديب والالتزام/ ل٤٧، كتاب العرب/ ل٢١٩

٦٦/ الاديب والالتزام/ ل٥٠

٦٧/ الواقعية الاسلامية في الادب والنقد/ ل٨٩.

٦٨/ مجلة التوحيد/ عدد(٣٤) ل٦٣

٦٩/ خصائص التصور الاسلامي/ ل١٥.

٧٠/ الاديب والالتزام/ ل٥٦.

٧١/ هەمان سەرچاوەی پیشوو / ل٦٠

٧٢/تأريخ العنف الدموي في العراق...محمد باقر ياسين

٧٣/ نوێكردنەوەی هزری نەتەوەیی كوردی" ب .د.عزەدین مستەفا رەسول ماڵپەری Hevgirtin. Net

٧٤/ عومەر عەبدولعەزیز/چەند راستكردنەوەیەك ..گۆڤاری پەیامی راستی ژ/٦٤ سالی ٢٠٠١/ز

٧٥/ حەسەن پێنجوینی / دیمانەیەك لەگەل گۆڤاری پەیامی راستی (ژ/٦٦ ساڵی ٢٠٠٢ز)

٧٦/ هادی عەلی / دیمانەیەك لەگەل گۆڤاری پەیامی راستی (ژ/٦٧ساڵی ٢٠٠٢ز)


## ژێـــــــــــــــــــــــــــــــدەر

١) **قورئانی پیرۆز**........

٢) بۆ لێکدانەوەی ئایەتەکان سوود لە (تەفسیری ئاسان)ی مامۆستا بورهان محمد امین وەرگیراوە

٣) ...ادريس الناقوري / قضيةالاسلام والشعر..(آفاق عربية – ط٢/ ١٩٨٦بغداد)

٤) السيرة النبوية لابن هيشام/ جـ٢ السنة ١٩٥٥.

٥) د. نجيب كيلاني/ الاسلامية والمذاهب الادبية .......

٦) د. نجيب كيلاني/ رحلتي مع الادب الاسلامي.................

٧) أحمد بسام ساعي / الواقعية الاسلامية في الادب النقد..............

٨) سيد قطب / خصائص التصور الاسلامي...........

٩) سيد قطب / منهج الفن الاسلامي...............

١٠) محمود الجومرد / الاديب الالتزام...... لسنة ١٩٨٠ بغداد

١١) محمد قطب / الطريق الى الادب الاسلامي..............

١٢) محمد باقر ياسين / تأريخ العنف الدموي في العراق...

١٣) تەواوی زانیاریەکان دەربارەی کۆنگرەکانی کۆمەلەی نووسەران لە تۆماری بیرەوەریەکانی مامۆستای هێژا (عومەر عەبدولعەزیز ) وەرگیراون....


*****************************************************